# سروە

ئەدەبی، فەرهەنگی، کۆمەڵایەتی - ژمارە ٣٦ - ساڵی ١٣٧٦





نەورۆز پیرۆز

ئـەم ڕۆژی ساڵی تازەیە نـەورۆزە هـاتەوە
جەژنێکی کۆنی کوردە بە خۆشی و بە هاتەوە

پیرەمێرد

# بەهارە

بەهارە و کاتی سەیری گوڵزارە ئەمڕۆ
غەمم کەم شادییەکەم زۆر و چارە ئەمڕۆ

کە غونچە بەپێکەنینی سەوزی کاچاک
چریکەی بولبولان هێشتگارە ئەمڕۆ

دڵی فکری لە مێی وەسەیری سروشتە کە
هەڵی عیرفان بەبێ هێژمارە ئەمڕۆ

مەجاڵیش هاتە سەر ڕێی ڕاستەقینە
کە ئاساری حەقیقەت دیارە ئەمڕۆ

لە خاکی شک و ئاوی ساف نییە ئێمی
بەیانیان دێ، کە ڕەحمەت بارە ئەمڕۆ

لە شەو بوونی نێرگس و گوڵ دێمەکە باس
لەبۆ عارف هەموو ئیقرارە ئەمڕۆ

هەتاکەی بابی چیرۆکی مناڵان
کە نۆبەی بابی خوەشی یارە ئەمڕۆ

گوڵی بەستەنیایش شتێکی عیشقە
ئەنەلحەق شێرە جێگای سەردارە ئەمڕۆ

من و ئەوگەر بە باچوودی ئالی عیشقین
دەکوو مەنسوورە کەی بێچارە ئەمڕۆ

لە سەرمان ناهەموو بادەی حەقیقەت
چ باکمان لۆمەپێ بەدکارە ئەمڕۆ

کە ڕۆشتین لە شوێنمان چی دەمێنێ
ئەوەی بۆ عاشقان ئاسارە ئەمڕۆ

بلا بادەڕدیی عیشقم هەر ڕەهێن بێ
کە مەجلیسێن جگەی بێ ئەغیارە ئەمڕۆ

ئەپڕی شێتی دەوی کامین نیگارم
لەسەر زەنگی زەرد ماخۆ دیارە ئەمڕۆ

لە دڵدایە هەتا عیشقی ڕۆحی یار
لە بۆ دڵ سەرێ گوڵ و گوڵزارە ئەمڕۆ

لە هەوری تەبعی من تۆ دەرسناسان
ڕەهێڵەی کە دەهەری شەهوارە ئەمڕۆ

لە بەر چین چینی زوڵفی گرژ و لوولت
دڵم چینی داوی ناهەموارە ئەمڕۆ

بەرەندی و عاشقی و بادە پەرەستی
ئەدی مەشهوورە شیرین کارە ئەمڕۆ

لە ناوت بەرزە جانانا دیاریم
ئەگەرچی خوار و بێ مقدارە ئەمڕۆ

شعر: سەید تاهیر هاشمی

خط: آیت محمدی پور

ئاوێنە

ئەدەبی، فەرهەنگی، کۆمەلأیەتی ژمارە ۳۶ - نرخ ۲۰۰ تمەن رەشەمەی ۱۳۷۶

■ ئاوێنە، هەر دوو مانگ جارێک دەردەچێ، سالی شەشەم، ژمارە ۳۶

■ تێبینی: تکایە وتار و بابەتەکان بە خەتێکی خۆش و لەسەر لایەکی لاپەڕە بنووسن «کۆپی نەبێ»

■ ئاوێنە دەستی والایە بۆ گۆڕینی رێنووس و بە پێی نیاز، هەر بابەت و وتارێک بە بێ گـۆڕینی نـاوەرۆک، رێک و پێک و ئامادە دەکات بۆ چاپ

■ خاوەنی بابەتەکان دەتوانن کورتەیەک لە ژین‌نامەی خۆیان و وێنەیەکیان بۆ ئاوێنە بنێرن

■ بلاوکردنەوەی هەر بابەتێک بە واتای پەسەندکردنی ناوەرۆکی لە لایەن ئاوێنەوە نیە

■ نـاو نـیشان: تـاران - ص.پ: ۱۴۱۵۵/۵۷۱۸

تەلەفون: ۶۴۶۷۸۴۳ - ۰۲۱

دەفـتەری کـۆوار: تـاران - شـەقامی بزورگمیهر - ژمارە ۴۶

■ بەرپرس: سەید محەمەد مووسەوی

■ سەرنووسەر: محەمەد عەلی چاووشی

■ جێگری سەرنووسەرو بەرپرسی نووسین: محەمەد کەمانگەر

■ دەرهێنەری هونەری: شەهاب قەنبەری

■ دەستەی نووسەران: سەید کازم ژارناوایی - داوود داوودی - ئەحمەد حاجی‌مەولوود - رێبوار ژوان

■ پیتچین: ئەحمەد حاجی‌مەولوود

Director Manager: SeyedMohammad Mosavi

Editor-in Chief: Mohammad Ali Chavooshi

Deputy of Deitor in Chief And editor Manager: Mohammad Kamanger

Art Director:shahab ghanbari

Tel: 021 - 6467843

P.o.Box: 14155 - 5718

Tehran - IRAN



● پشتی بەرگ: کاری هونەرمەند: هادی زیادینی

تـازەبوونەوەی سـروشت و هـاتنی بـەهاری دلـرفێن، لە خـوێنەرو هۆگرانمان موبارەک بێ، و هـەموو رۆژێکتان جێژن و جێژنتان لێ پیرۆز بێ.

«ئاوێنە»

ناونیشان: تاران - ص.پ: ۱٤۱۵۵/۵۷۱۸
تەلەفون: ۶٤۶۷۸٤۳
دەفتەری کۆوار: تاران - شەقامی بزورگمیهر - ژمارە ٤۶

نشانی: تهران - ص.پ: ۱٤۱۵۵/۵۷۱۸
تلفن: ۶٤۶۷۸٤۳
دفتر مجله: تهران - خیابان بزرگمهر - شماره ٤۶

# سەروتار

دوو بەهاری، سروشت و شۆڕشی ئیسلامی پێداوەیەکی خوداییە، هەر دوو بۆ مرۆڤ کە دەبێتە هۆی بەختەوەری هەر دوو جیهان و داهاتوێکی روون بۆ کۆمەڵگاکان و گەلاّنی ئازادی خواز و هەق خواز دابین دەکات.

دەیەی فەجەر یاداوەری رۆژەکانی تاڵو شیرین و رووداوەکانی گرنگ و ژیانبەخشە کە رێبەندانی ساڵی ١٣٥٧ بە هاتنەوەی دامەزرێنەری حکومەتی ئیسلامی، واتە ئیمام خومەینی (رە) بۆ ئێران، گۆڕانگاریەکی بنەرەتی لە جیهانی ئیسلام بە هێناو حکومەتی نەگریسی پەهلەوی کە دابینکەری سیاسەتەکانی زۆردارانەی ئیستکبار، بە تایبەت ئەمەریکای خوێنڕێژ لە ئێران و ناوچەی کەنداو بوو، روخاو کۆماری ئیسلامی ئێران دامەزرا. لە ٢٢ی رێبەندان دەها هەزار شەهید کە لە ساڵانی رابردوو لە پێناوی خەباتی هەقخوازانە خوێنی خۆیان پێشکەش کردبوو بە ئاکام گەیشت و خونچەی ئازادی و سەربەستی پشکوت و شۆڕشی ئیسلامی سەرکەوت.

ئێستا کە ٢٠ بەهار لەم هەنگاوە بەرزو پیرۆزەی گەلی موسڵمانی ئێران تێدەپەڕێ، هێشتاش پێ گەیشتن و پەرەپێدانی شۆڕش لە سەراسەری جیهان دەبیندرێ. هیواداریـن بە هۆی پەرەسەندنی بایەخەکانی ئیسلامی و ئامانجە پیرۆزەکانی ئیمام خومەینی (رە) و شەهیدان، دنیا پڕ لە عەدل و داد بێتو ببێتە هۆی پێکهاتنی حکومەتێکی یەکگرتووی ئیسلامی لە دنیا دا.

پیرۆزبایی ساڵهاتی شۆڕشی ئیسلامی بە تەواوی مرۆڤە ئازاد و هەق خوازەکان دەکەین بۆ ئەو گیانانەی کە لەو رێگایە دا فیدا بوونە، پلەی بەرز داوا دەکەین.

لە رەشەمێی ١٣٦٦ رووداوێکی دڵتەزێن و خراپ لە مێژووی مرۆڤایەتی رووی دا، ئەویش قەومانی بوردومانی کیمیایی شاری هەڵەبجەی عێراق و کۆکوشتاری بێ بەزەییانەی پتر لە ٥٠٠٠ خەڵکی بێ تاوانی ئەو شارە لە لایەن فڕۆکەکانی رژێمی پیسی عیراق بوو، داغ و برینێکی لە بیر نەکراو لە جەستەی مرۆڤ بوو. ئەوەی سرنج راکێشە بێ دەنگی کۆمەڵگاکانی نیونەتەوین و داواکارانی درۆینی مافی مرۆڤە، کە بەرەی داهاتوو لەبارەیەوە را دەردەبڕن. رووداوی هەڵەبجە لکەیەکی رەشو پیسە بە نێو چاوانی رژێمی بەعسی عێراق و ئەو کەسانەی لەو کارەساتە دڵتەزێنە یارمەتی سەدامیان داوەو ئەو روورەشیە بۆ هەمیشە لە مێژوودا دەمێنێتەوەو ئەمەش راستییەکی ئاشکرایە جیهان بووەتە دوو جەمسەری پێ پەتیەکان و زۆرداران، لەم نێوانەدا شۆڕشی ئیسلامی ئێران رابەرایەتی چەوساوەکانی دنیای بە ئەستۆ گرتووەو ئەمە ئەرک وئەسپاردەی هەموو موسڵمانەکانی لە کوردو تورک و عەرەب و فارس قورستر دەکات.

لێرەدا بەوانەی لەو بوردومانە کیمیاوی‌یەی هەڵەبجە گیانیان بەدەربردووەو رزگار بـوون و هەروەها بە یەکێتی دنیای ئیسلام و برایەتی و هاودڵی هەموو ئینـسانە ئازایخوازەکان پـرسەو سەرەخۆشی خۆمان رادەگەیەنین و هیوادارین هەموومان پێکەوە پیلانەکانی دوژمن لەناو بەرین و ئیتر ئەم جۆرە رووداوانە نەقەومێن.

بە هاتنی وەرزی بەهارو دەست پێکردنی سەری ساڵ و جێژنی نیشتمانی و نـەتەوایـەتی نەورۆز کاتی پشکوتنی سروشتە، کاتی سەوز بوونی گژو گیاو رازانەوەی دەرو دەشتە، کە دڵی هاونیشتمانە بەڕێزەکانمان لەم وەرزەدا پڕ ئەبێ لە شادی و خۆشی، سەهۆڵی دڵ ئێشان ولێک دوورکەوتنەوەو دوو دڵی ئەتوێتەوە، لە نێوان خەڵکی کوردی ئێمەدا داب و دەستورێکی تایبەت هەیە، بۆ بایەخ دان بە نەورۆز و رێزگرتنی لەم جێژنە بە وێنەیەکی زۆر جوان وخۆش، خەڵک دەچن بەرەو پیری ئەو جێژنە، چون ئەو جێژنە دەبێتە هۆ بۆ بووژانـەوەی زەوی وپشکـوتنی سروشت و دڵ و دەروونی مرۆڤ، بە فەرمودەی ئیمام سادق(ع): جێژنی نـەورۆز حـەرەمی ئیلاهیەو مرۆڤ لە نامەحرەم و شەیتان و شۆفار دەپارێزێت.

لە فەرمودەی حەزرەتی عەلی(ع) ئاوا هاتووە: «کُلُّ یَومٍ لا یُعْصَی اللّهُ فیه فَهُوَ عید»، واتە هەر رۆژێ کە تێیا تاوان و بێ‌فەرمانی خوا نەبێ، ئەورۆژە جێژنە. ئەم جێژنە گـەورەیە بـە هـەموو هاونیشتمانە موسڵمانەکان لە ناخی دڵەوە پیرۆزبایی دەڵێین‌و هیوادارین ساڵی تازە بۆ هەموو خەڵکی وڵات پڕ بێت لە خێرو خۆشی و بەرەکەت و بەختەوەری و ئیمانو باوڕو مەعنەویت بۆ گشت جیهانیان.






• نووسینی: عەلی ئەشرەفی دەروێشیان

وەرگێرانی: ئومەری وەلەووەگی


پێشکەشە: بە گیانی پاکی ئەو کۆرپە ساوایانەی هەڵەبجەی شەهید لە بنارێکی نامۆو غەریبودا بێ کێل و مەزار نێژران.

لە سووچێکی هەیوانەکەدا، لە ژێر تیشکی رۆژجیاردا دانیشتبوون و خۆیان دابووە بەرخۆرەتاو، بەفرین خۆی نووساندبوو بە سینگی دایکیا.

ژنەیش، کچەی لەسەر شلگەی رانی تابوو. پسکە زێرینەکانی بەفرینیش، لە ژێر دانەی شانە دارینەکەی دەستیا، نەرم و نیان کەوتبوونە سەر شان و گەردنی وەک مرواری و بە ملیا شۆڕ ببوونەوە.

هەر جارکە قژی شانە ئەکرد، وەک پیاڵە لوولیان ئەخواردوئەڕژانە سەر شان و ملی:

«ئۆخ گوێم، گوێمت کەند.»

«چییە کچێ؟! خۆ گوێت لۆکەنی یە. جا خۆ گەر مرۆڤ گوێچکەی بە شانەکردنو قژداهێنانێ دەرهاتبایە، ئێستا لەم دونیادا یان هەموو تەل‌بوونو یان کەسێ گوێ دارت نەدەدی.»

بەفرین خێرا و گورجێ دەستی لە گوێچکەی‌دا، بە وردی و ژیرانە چاوی بڕیە سەری قامکەکانی هەتا دڵنیا بێ گوێی خوێناڵین نەبووە.

دایکی بە گاڵتەو تەشەرەوە پێی وت: «هەی هەی، هەی هەی، خۆ گوێچکەت نەماوە، وا دیارە ئاگات لێی نیە، دەبێ ئەمڕۆ بچم بەدوای

مامۆ مەقدووراو گوێچکەی بزنەیەکت بۆ بکڕم.»

کوڕەش لەسەر هەیوانە سواق دراوەکەی خۆی خویساند بوو و خەریکیش بوو لە خاک و خۆڵەکەی ژێری، بە ئەنگوستی خۆڵی دەخوارد. ژنە رووی کردە کوڕەکەی: «ئۆ هۆ یۆسفڵێ... قخە... قخە... هەی داوەشێی کوڕلە بۆ کارو کردەوەت! چاو چاو چ ملچە ملچێکی ناوەتەوە. چارەرەش ئێژی خەپلە چەورە ئەخوا.»

چڵمی لووتی کوڕلە وەک گوونە شەیتان فووی تێی دەبوو. یۆسفڵێ بە قنگە لیژکە خۆی گەیاندە لای دایکی، بەفرینیش هەر چلۆنێ بوو خۆی لە نێو قاچ و قولی دایکیا دەرباز کرد. ژنە بە سووچی کراسەکەی (فەقیانە) لووتی منالەکەی سڕی. ئەنگوستی کرد بەزاریا و کولۆیەک خاکی دەرهێنا. چڵمەکەشی بەسەر نەخش و نیگاری کراسە ئاڵو رەنگینەکەیا دەخزاو نەختە نەختە وشک هەڵدەگەڕا.

ژنەش چووە نێو هۆدەکەوە، لە سووچێکی تاریک و نووتەکی ژوورەکەیا، شڕە پەلاسێکی هەڵگرت و لەسەر زەوی رای خست.

یۆسفڵێ پێچا شڕە پەلاسەکەوە، بەفرینیش بەرەو لای دایکی چوو و لە پشت سەریا راوەستا. ژنەش، کوڕەی بەست بە کۆڵیا: «ئەگەر دەستی کرد بە بێ تاقەتی و گریان، بیکەوە، ئاگات لێی بێ، نەیخەیتە زەوی یەوە! وریای مریشک و جووجەڵەکانیش بە. دەس نەکەی بە کونی مارومێروودا!

ئاگات لە خۆت بێ شتی پیس و پۆخڵ نەخۆی.

بۆ نانی نیوەڕۆت نەختێ لە زەڵاتەکەی دوێنێ شەو ماوەتەوە، دەمەو نیوەڕۆ لە تەک ناندا بیخۆ، نانو تەنیشم لەسەر رەفەکە داناوە.

هەر کاتێ یۆسفڵە برسی بوو، وزدی بکەو بیکە بە تریت بۆی و بیدەیە با بیخوا. مەهێڵە مێش و مەگەس دەوری بدەن.»

هەروا کە خەریکی مۆچیاری کچەی بوو، نانی رێگاشی دەنایە نێو تونشە بەرەکەیەوە، بەرەو دیوارە گڵێنەکە چوو و لەبەر خۆیەوە گوتی:

ئەمە دووانە کەو ئەمەش تەورداسەکە، لە سووچی ماڵەکەدا هەڵیگرتن و بەستنی بە کۆڵیا.

گورنەکەش کە لەسەر پەیژەکە بوو هەڵیگرت و خستیە سەر شانی.

هێشتا پێی نەنابووە سەر پەیژەکەی ماڵ کە بەفرین یۆسفڵێی لە کۆڵ کرد. دەستی کرد بە گیرفانیاو نامەیەکی گرمۆڵە کراوی لە باخەڵیا دەرهێنا. چەن دێڕێ لە نامەکەی کە ئەنگوستی بەسەردا روو کا بوو نەدەخوێندرایەوە پێشانی دا. ملی لارەوە کرد، بەو پەڕی شەرمەوەو بەتکاو لاڵەو پاڕانەوە گوتی: «دایەگیان هەمیسان بۆمی دەخوێنیەوە؟»

ژنە ئاوڕی دایەوە، زەردەخەنەیەکی کاڵ نیشتە سەر لێوانی، نامەی لە کچە سەند. واق و وڕی روخساری زەرد هەڵگەڕاوی کچە بوو: «خەریکە درەنگ ئەبێ. دوو رۆژە ئەونامە هاتووەو سەد جاران بۆم خوێندویەتەوە، بە خودای تەواو شەکەت بووم.» لە پڕێک دڵی بۆ کچە سووتا. دەستێکی هێنا بەسەر قژە ئاڵۆزەکانی بەفرینا:

«ئەمڕۆ کچی چاک بە، هەر چیم پێ وتووی باش ئەنجامی بدە هەتا دەمەو ئێوارە لە کەژی دەگەڕێمەوە، جا هەمدیس بۆتی دەخوێنمەوە.» بەفرین سەری تا بە سینگی دایکیەوە و ئەهوەن و ئارام ئارامێ کراسەکەی ماچ کرد. نامەکەی رفاندو نایە گیرفانی.

هەر دوو دەستی بە دەوری قنگی منالەکە داگرێ دا. منالی بەسەزمان کە هەستی بەوە دەکرد دایکی گەرەکیە لێی دوور بکەوێتەوە، ئاوڕێکی دایەوەو چاوی بڕیە دایکی، بەلام بەفرین دەستی کرد بە هەڵهات و گەمەکردن. زارۆکیش کەوتە تریوە تریو و پێکەنین.

بەفرین بەرەو لای خواری حەوشە هەڵهات و لە پاڵی کولانەی مریشک و جووجەڵەکاندا دانیشت. دایک، لە نێو کووچەو کۆلانا، گوێی لە تریق و هوڕ و قرمەو پێکەنینی منداڵەکەی بوو و دڵی ئۆقرەی گرت.

ژنە گەیشتە بناری گردەکە. بەنی دووانەکەی مەچەکی تەواو ئازار دەدا. کردیەوەو بەستی بەو دەستەکەی تریدا، گورنەکەشی گوێزتەوە، چاوی بڕیبووە توولە رێگاکەی سەر گردەکە، کە تا دەهاتە خوارێ، هەر پانو بەرینتر دەبوو، کابرایەک خەریک بوو کۆڵە چڵکێکی لەسەر گردەکەوە بەرەو خوار تل دەکردەوە. ئنجا بە شوێن کۆڵە چڵکەکەیدا بەرەو خوار رێی دەبڕی و لە توولە رێگەکەوە لای دەدا، تەپ و تۆزێکی سەیر تەواو ئەو ناوەی تەنی بوو، جا بۆ چەن ساتێ کابرا نقومی نێو تەپ وتۆز و خاک و خۆڵەکە بوو و روخساری دیار نەبوو. مامۆ مەقدووری شوان چەن هەنگاوێ دوور لە رانەکەی، بەبێڵەکانەکەی دەستی خەریکی پیشۆک کەندن بوو و دەستی کرد بە چڕینی ئاواز و ستران و ئاهەنگێکی خەماوی و غەریبانە.

«بە گاوەسنی خەم، زەوی و زاری خەمم کێلا، ئنجا دانەوێڵەی خەمم تیا چاند، بەرهەمم خەم بوو، بە داسی خەم دروێنەم کرد، دانەوێڵەی خەمم بردە ئاشی خەم، ئاردی خەمم بە ئاوی خەم کردە هەویرو بە ساجی خەمادا، نانی خەمم نایە سەر سفرەی خەم، هاوسفرەکەم خەم بوو، لە پاڵیا دانیشتمو بە خەمەوە خواردم.»

«سلامەلێک مامۆ مەقدوور!»

پیرە پیاوی پشت کۆم سەری هەڵبڕی: «سلامەلێک و عەلیکی سەلام، سەلیمەخاتوون خەوەرو باسی حەمە!»

«دوو سێ رۆژ لەمەو بەر نامەی هاتبوو، نووسیوویە هەتا چەن رۆژی دیکە دێتەوە بۆ سەردان.»

«خوا پشت و پەنای، ئیشەڵا بە خێرو سەلامەت.»

«سەلامەت بی مامۆ، خوا تۆمان لێ نەسێنێ.» سەلیمە گەیشتە لای دار بەرووەکەی بناری گردەکە، تەلەرەشەیەک بەسەر دار بەرووەکەوە نیشتەوەو دەستی کردە قارەقار کردن، سەلیمە رووی کردە قەلەرەشەکە: خۆش خەوەر بی... خێر بێ... خوا وەخێری گێڕێ، بە قامکی شادەی، ئارەقەی نێو چاوانی سڕیەوە، پشتی بۆ کۆم کردو توولە رێگەکەی گرتە بەرو بەسەر ملەدا، داگەڕا.

لە نێوەراسی رێی داگەیشتە کابرایەک کۆڵە چڵکێکی بە کۆڵەوە بوو، ئازا دراوسێ کەیانی ناسیەوە! «ماندوو نەبی خاڵۆ مەلوو.»

رووسوور بی خوشکم، بۆ وا درەنگ هاتووی!» سەلیمە هەناسەیەکی هەڵکێشا:

«خاڵۆگیان ژنی منالدار لەتێکی هی خۆی نییە. هەتا بڕێک بە منالەکانا راگەیشتم نیوڕۆم وەسەراهات.»

کابرا وتی: «راسە، بەلام بەهار باشی یەکەی لەوە دایە هەر کەسێ دەگات بە ئاوات و مرازی خۆی، رۆژگاری تەواو دوورو درێژە، گەرەکەت بێ هەر کارو هەرمانێک بکەی پیاڕا ئەگەی. ئنجا دەستی بەرەو ترۆپکی گردەکە راداو چاوی بڕیە شوێنێکی دیاری: «ئاگات لە هەژگ و دارو دەوەنەکان بێ. جڕو جانەوەران لە





ترسی گرمەو هارەی میگ و میراژ... هەڵدێن و لە نـاکـاو هـەر وەبـزانـە هـەتا لات کـردەوە پـەلاماریان دای.». «ئـاگـام لە خـۆمە گـیانی خاڵۆی، مرۆڤی رەش و رووت پاڵەواتی خوایە. خۆم لەوان چیم کەم نییە.»

بـەهارو دیـمەنی ئاڵ و رەنگینی هـەموو لایەکی خەملاندبوو، (بـا)یش لە تـەک خـۆیا بۆنی تاڵی هەراڵەی ئارژنگی دەهـێنا، سـەلیمە تەواو ماندوو شەکەت بوو. بە چەپ و راسدا بە تەورداسەکەی دەستی کەوتبووە گیانی هەژگ و دارەکان و دایدەپاچین و خۆش خۆش ئارەقەی دەرئەدا.

روخساری لە سووری سێو دەچوو و وەک نانی ساجی ناسک و باریکی لێ هاتبوو. دەمەو ئێوارە بوو زەردەی سەر کەل، هێور هێور ئاوا دەبوو. پاڵی دا بە قوتەرەیەکەوە، ویستی دەمی دووانەکـەی بکـاتەوە کـە لە نـاکـاو نـرکەیەک بێشەکەی وەهەشەکە خست، چەن هەراڵەیەکی ئارژنگەکەی کەژی هەڵوەرین و بێ نـازکەوتنە سـەر عـەرد. سـەلیمە بـە تـرس و لەرزو دڵە خورپەوە وەخۆ کەوت، سێ فرۆکە بە راسەریا دەسووڕانەوەو بەرەو بەرزایی و تەشقی ئاسمان دەچوون. لەو دیوی گردو تەپۆڵکەیەکی ئـەو نـاوەدا، تـەپ و تـۆزی تـەقینەوەیەک، مەحشەرێکی ساز کردبوو. شەماڵ و سروەی فـێنکی بـەهاریش هـێندی - هـێندی غـوبارو تۆزەکەی لە تـەک خـۆیا ئەبردو ئـەیکرد بـە ئاواییا کە ئێستە لە ژێر پێی ژنەدا مات‌وکپ و بـێ دەنگ، درێـژ درێـژێ هـەلاژا بـوو و خانووەکانی نـیشتبوونە سـەر یـەک و دەنگی قاڕەکەری لێوە نـەدەهات. سـەلیمەش ئـارام و هـێورو لەبـەر خـۆیەوە کـەوتە چپەو سـرتە: «خوایـە شـوکرم بـە دەرگـات. لە ئـێمەوە زۆر دوورە.» هەر کە نرکەی چەن تەقینەوەیەکی تر هات مەلووچەکان ئـازاو گـورجێ لە شـەقەی بـالانیان دا و رێـی کـۆچیان گـرتەوەر. بێ دەنگی‌یەکی سەیرو بە سام باڵی بەسەر هەموو لایەک داکێشا بوو. دەنگی شـوڵ و چـێوێک بەسەر درەختێک دا وەبەر گوێچکە دەکەوت کە هەروەک خوراندنی لاشە بە نینۆک بوو. بۆنێکی پیس و نامۆ لە جیاتی بۆنی تاڵی هـەراڵەکـانی ئارژنگی کەژی ئەو نـاوەی تـەواو تـەنی بـوو. سەلیمە هەستی بەوە کرد گـەرووی دەخـورێ. دەستی کردە کۆخەوقفە.

ئـنجا هـەستایە سـەر پێ و بـە دڵێکی خەمینەوە، کۆڵە چڵکەکەی بە توولە رێگـا پڕ پێچ و پەنا کەدا تل کردەوە.

واخۆریش خەریک بوو ئەپەڕی و سێبەر دەنیشتە سەر بنارو لاپاڵەکـانی ئـەو نـاوە، کـە زەردەی سەرکەل ئاوا بوو، ئـاواییش رەنگی کەوە دایئەگرت، سەلیمە خێرا گورێسەکەی بە دەوری دەسیا جەڕاندو هـێور هـێورو لەسـەرە خۆ بە دەم ئارەق رشتنەوە لەسەر هەر تەپۆڵکەو پێچ و پەنایەک داکۆڵەچڵکەکەی تل دەکردەوەو گورێسەکەی سفت و سۆڵ دەکردەوە نـەوەک کۆڵەکەی بشێوێ و لە تـەک خـۆیا بـیبا هـەتا قوولایی و خواری دۆڵەکەوە. هەر کە گـەیشتە سەر دوایین پێچی گردەکە کەوتە هەناسە بڕکێ، بۆنی نامۆو نا ئاشنا هێشتا هەر بەو ناوەدا پەرش و بلاو بوو.

جار جارێ دەهاتە لووت و پاشان شـنەی فێنکی (با) لە تەک خۆیا ئـەیبرد. سـەلیمە بـە ناچاری تۆزێ بۆی دانـیشت و بـە هـەرگێرەو کێشە و هەوڵ و تەقەلایەک بو کۆڵە چڵکەکەی بـە کـۆڵەوە گـرت. نـێو لەپـی دەسـتی تـەواوهـەڵدەقرچاو قـرچـە و چـزەیان زۆری



ئازاری دەدا.

گەیشتە لای دار بەرووەکە، قەلەرەشەیەک بە دەمدا کەوتبوو لاقەکانیشی رووەو ئاسمان بوون، مامۆ مەقدوور هێمن و بێ دەنگ پاڵی دابوو بە دارێکی ئەو ناوەوە، ژنە ئاگای لە خۆی نەبوو مامۆ مەقدوور هەروەک جاران پێی وتبێ:

«ماندوو نەبی، بە خێربێیەوە!» بەڵام ژنە لە قوڵایی دڵەوە، هەناسەیەکی هەڵکێشا و وەک جاران وەرامی دایەوە، «سلامەت بی مامۆ گیان!»

ئنجا بە دوو دڵی و رارایییەوە چاوی بڕیە مامۆ مەقدوور.

مامۆ سەری نابووە سەر ئەژنۆی، بێلەکانەکەی لە ژێر سەریا دا نابووو دەسەکانیشی بەرەو پێش داڵوچابوون.

بنجی گیایەکی نیوە خوراو لە وەردەم پێیا کەوتبوو، ژنەوای زانی مامۆ خەریکە بەنی خامینەکەی گرێ دەدا. ئنجا کۆخەیەکی بۆکرد و بە دەنگێکی بەرزەوە وتی:

«مامۆ ئەتۆ کە هەمیشە و دایمە لە خەو دای، دەمەو ئێوارەیە. ماڵئاوا، کەنگێ گەرەکەتە رانەکەت بەرەو ئاوایی بگەڕێنیەوە؟» مامۆ تەک و جمی لە خۆی بڕیبو جووڵەی نەدەکرد. ژنە چاوی بڕیە کاوڕ و مەڕو ماڵاتەکە. سەریان نابوو بە پشتییەکەوەو بارەو قارەشیان لێوە نەدەهات. کاوێریشیان نەدەکرد. سەی ئێورانەکەیش، لەسەر تەختایییەکی ئەو ناوەدا پاڵ کەوتبوو، شنەی شەماڵ و سروەیەکی فێنک دەشنایەوە، بۆنەکەی جارانیش ئێتر نەما، بەڵام ژنە هێشتا هەرگەرووی دەخورا، بە دوو دڵی و رارایی و گومانێکی سەیرو نادیارەوە گورێسەکەی بەردا. کۆڵەکەی دانا. بەرەو لای مامۆ مەقدوور چوو. پەلەوەرێک لەو ناوەدا دەستی کرد بە جیکە جیک و جریوە جریو:

«کەکوو کەکوو... کەکوو کەکوو. ...کەکوو کەکوو...»

سەلیمە ترسێکی بەسام و گران نیشتە سەر دڵی، بەڵام چووە پێشەوە، بە رارایییەوە دەستی نایە سەر شانی مامۆ: «مامۆ بۆچ...» مامۆ لە خاک و خۆڵا گەوزیبوو و چاوانی واق و وڕی تاقی ئاسمان بوون.

سەلیمە قیژاندی و لە مامۆ دوورکەوتەوە، پێی بە مەڕێکدا هەڵکەوت و بە دەما کەوت بە قیژە و هاوار و ناڵەی، گوێی ئاسمانی کەڕ کردبوو، لە جێی خۆیدا وشک هەڵگەڕابوو. سەلیمە کەوتە سینگ کوتان، قێسەکەی کەوتە زەوییەوە، ئنجا کەوتە تۆڕنینەوە، بە نینۆکی کەوتە گیانی دەم و چاوی و تەواو رووی خۆی کۆڵەوار کرد و بە ئەژنۆی شەکەت وبێ هێز و هازەوە بەرەو ماڵێ هەڵهات.

لە دەوروبەری ئاواییا گەیشتە لای یەکەم ماڵ، یانەی خاڵۆ مەولوو بوو، کۆڵەچڵکەکەی هێشتا لە پاڵی دیواری حەوشەکەیا نابوو. خاڵۆ مەولوو نەختێ بەلادا چەمی بووەوەو پاڵی دا بوو بە دیواری ماڵەکەیانەوە، کڵاشێکی نیوە چنراوی بەدەسەوە بوو. گوڵۆڵە دەزووەکەی شۆڕ بیبووەوە، سەری دەزووەکەی بۆ بادان لە ژێر ددانەکانیا بە گۆشەی لێویا هەڵواسرا بوو. سەلیمە بە چنگە کرێ کەوتە گیانی دەم وچاوی، لە ژێر نینۆکەکانیەوە خوێن فیشقەی دەبەست و دەچۆڕی. قیژاندی: «خاڵۆ... خاڵۆ چیت لێ قەوماوە، بۆ وات لێ هاتووە؟!»

خاڵۆ مەولووی داماو چاوانی دەرپەڕیبوون و نیگای واق و وڕی پاساری دیوارەکەیان بوون. بۆنی نامۆ بە هەر شنە بایەک فرەو کەم دەبوو، ژنە پەیتا پەیتا ئەقفی و بە پاڵ پێوە نانێکەوە، دەرکە دارینەکەی حەوشەکەیانی کەپاڵی دابوو بە دیواری ماڵی خاڵۆ مەولووەوە، کردەوە: «بەفرین... هۆ بەفرین، کورپەی شیرینم لە کوێی؟!...» بە چەن هەنگاوێکی خێراو پەلەپەل خۆی گەیاندە لای کولانەی مریشک وجووجەڵەکان: «بەفرین خان و یۆسفلێی خوێن شیرین و نازارم، خەویان لێی کەوتووە، دەک رۆڵە بەسەرگەردتان بم.

نیوەرۆ شتێکتان خواردوەیان نا!»

بەفرین خان وەک دایکێکی پڕ سۆز، یۆسفلێی لەسەر قۆڵو باسکی وەک شمشادی خەواندبوو.

جووجەڵەکان بێ هێز و هاز لە تەنیشت مریشکەکە دا بەلا دا هاتبوون.

مریشکەکەش کلکی جووت ببوو جووڵەی لێی بڕابوو. ژنە ئەوی لە دەستی کورپە ساواکانی و توندێ رایوەشاندن، بەشکوو راچڵەکێن. نامەکەش لە نێوان یۆسفلێ و بەفرینا ئارام و هێدی بە شنەی با دەلەریەوە. چەن دێڕێکی ملۆچەکراوی تری نامەکە، تەواو رووکابوو باش نەدەخوێندرایەوە: «کچی خۆشەویست و نازنینم بەفرین خان، لە دووری دوورەوە وەگونا ئاڵەکانت ماچ دەکەم و چەنەی جوان وخڕت و خڕت گاز دەگرم. هەتاکوو چەن رۆژی دیکە لە خاوەن کارەکەم ئیجازە وەردەگرم و...»

مێروولەیەکی رەقەڵە بەسەر چەنەی کەوە بووی بەفرینا بە لەتە نانێکا لکا بوو.

# چاوی خوێنینی شەوەق

## مەلا عومەر ساڵحی ساحیب

شیعرەکانم بەستەی شینن
ئاراستەی دەستەی بێ تینن
گوڵی ئاخن
لەسەر گۆڕی، کۆڕی لێقەوماوا شینن
خونچەی گوڵی زەردو سورن
عەینی خوێنن، خودی دەردن
ئاوی چاوی ئافرەتێکی بێکەس، لە زستانی سەردن
مەتەرێزێکی رووخاوی
کوردێکی ئەژنۆشکاون
سوارەی فرمێسکی لە لێژی روومەتمدا هەڵگلاون
چاوی خوێنینی شەوەقن
لرخەی قورگی (انا الحق)ن
دوایین ترپەی سینگی تەنگی بێ ئاکامی رەق و تەقن
تەقەڵی درومانی جلی هەتیوی گیان بوو بە ملن
کفنی کۆن و کەم و کوڕی
جۆگەی بێ ئاوی پڕۆ بووی
پڕ لە خۆڵ و خیز و خاکن
چاوەڕوانی هێزی پاچ و بێڵی
جۆماڵێکی چاکن
برپاو خۆزگەی جێ نەهاتوون، تاسەی تاساوی ساردۆبوون
شاخەوانی سەرنجێکی
بە لوتکەیی بەردۆگیر خواردون
لەسەر کوڵمی هەستو هیوا خەت و خاڵێکی سڕاوەن
لە مل کیژی مژۆڵم دا
ئاقیق و مووررووی چڕاوەن
کەژاوەی خالی لە بووکن
هەرچەن بەختی رەشی خەیاڵ زاوایەکی بە تەما بوو
هەرگیز بووکی نەهاتە ماڵ
پەری جوانی دەقی سەد گۆنا شکاون
بە لێوانێ کە بۆ دڕلی
دەخنکێنێ گەرووی کوژاڵکە کێوانێ
دەمی دوراوی گڕوگاڵی مناڵی شیرەخۆرن
باڵە تەپێی کۆترو کەوی دیلی داوی جۆراجۆرن
لەسەرە رێی بای زەمانا
قنگلاشکی بێ مەوتەنن
دەربەدەری وڵاتێکی هەرە دوورو بێ کەوشەنن
چاو قرتاندنی دواجاری ئەستێرەی ژینی پیاوێکن
لە ئاخرین ئاویلکەشا
تینوی سەرنجی چاوێکن
بولبولێکی کز هەڵنیشتوون
لە قەفەزی سینەی خەما
بە نەوشەی لارەمل و بێ ئاون
لە قەراخی چەما
بەژنی بەرزو رێکو پێکی گەنجێکن
سەر بە دارۆیە
ئەوەی قەبری لە دڵمایە
مایەی وشەم بە زارۆیە
تاڵەی رەش و
دەنگی ناڵەی دڵی ئاوارەی شەکەتن
هاواری خاوو خێزانی لە ژێر ئاوارا لەت لەتن
لە هەڵەبجەی وێرانەدا، لێوی ئاڵن
قژی کاڵن
پێکەنینی دەمی برینی
شەهیدی بێ هەواڵن
مانای وردی
نووکە نووکی
کیژە کوردی بێ گوناحن ـ ئەوانەی وا لە سەردەمی، سەدەی بیستا خوێن
مەباحن
قیژەی مناڵی شارانن
شیعری بێکەس وەبیر دێنن
من مناڵم دەرم بێنن، تۆ خوا ئەگەر بم سوتێنن
هەڵمی خوێنی زامی زاری بەناسۆری بێ هەتوانن
بارمتەی خەمی بەرهەقی
ناهەق دەرهەق
بە نەتوانن
قرچەی دڵی دایک و بابی
تاقانە کوڕ لە دەس دەرچون
یا دایک و باوکە رۆی کچە نازدارێکی بێ نازکەوتوون
بەڵام هێشتا بەم حاڵەوە
شیعرەکانم
بەڵێن دارن
چقڵی چاوی راست و چەپی
سپی و سووری
ئیستعمارن
هەتیونکی قیت و زیت و هارو هاج و چەقاوە سوون
ئاوروو بەری هەر کەسێکن، بێ حورمەتەو
چەوتو چەتوون
وەجاخی رۆشنی مێژوون
بۆ نەتەوەی گەلەکەمان
بەمان هیوادارن بەمان
بەوان دەگرن رێگەی ئەمان
بەڵێ تاقەداری دەشت و کەویرێکی چۆڵ و هۆڵن
بەڵام بە تاقەت و زبری و سفتت و سوڵی
گوێ بەکۆڵن
گیرفانی پڕ فروفێڵی چڵکاو خۆرەکان دەبڕن
جەرگی درۆی زڵی خێڵی چاوشینەکان



هەڵئەدڕن
ڕۆڵەی نەترسن
دەپرسن لە نەتەوە یەکگرتووەکان
ئەرێ مافی بەشەر چییە؟ وتووتانە بە مەومانان
شەرم مەکەن
سوێنت ئەدەم بەگیانی دۆلارو فرانک
بە وەی ئاقل دەکاتە خەو
شەرەف دەخاتە شانکە شانک
بڵێین
تەڵەیە؟
کەڵەکە؟ هەڵەکردن لە هەر گەلە
تۆپە؟ گوللەیە؟ تفەنگە؟ بۆمبایە؟ گازی خەردەلە؟
تاقیکردنەوەی مووشەکە؟
وەڕەی سەگی فڕۆکەیە؟
قڕکردنی ژن و پیاوو کوڕ و کچی هەڵەبجەیە؟
لە دەی مادەی بادە، سادەی
هەر چەن نابێ بۆ ژینی من، لە مافی مافیا لادەی
شەرم مەکەن
مافی بەشەر بڵێن چیە؟
قانونیە؟ یا فرو فێڵ فیقیە؟
ئەرە؟
شەرە؟
ئەشکەنجەیە؟
سوتانی هێروشیمایە؟
مردن بردن بۆ سەبرایە؟
قەلاّ چۆکەی شەتیلایە؟

شەرم مەکەن بلێن مافی بەشەر پایە «کایە»
کایە بو (کانی) زێڕو زێوەکەی
ڕەشەکانی ئافریقایە؟
مافی بەشەر لە قوڕنانی بەهەشتێکی وەک لوبنانە؟
شالاّو بۆ خەلیجی فارسە؟
هێرش بۆ خەڵکی ئەفغانە؟
مانی مافی بەشەر
حەققی وێتو دانە، بە زۆر و بە زەڕ
لە عاسمان، لە سەرزەوی
لە کەم، لە زۆر
لە وشک و تەڕ
وەکوو ئەوە بەشەر نەبین مافی بەشەر بۆ ئێمە نین
بۆ رووسە، بۆ ئامریکایە، بۆ فەرەنگ و ئینگلیز چین
مافی بەشەر
لایەنگری بەشەر کوژو چەک بەدەسە ناوی پەیمانی، ژێیو و منیومە
جنێو بەسە ئادەی ئێوە بڵێن
مافی بەشەر ئەگەر ئەمانە نین
ئەی بەس چیە؟
ئازادیە؟
بە نێو نیشانی فەلەستین
شیعرەکانم پشو نادەن لە هەر مەرج و چەل و هەلا
تا خۆر دەس لە ملی گەلم نەکا
لە ئاسۆی ئەمەلا
شیعرەکانم
پاڕانەوەی «کۆلیل»ێکن لای خودادا
شمشێری تۆڵە ئەستێنن
لە دیوانی عەدڵ و دادا

## لە دایکبوون بۆ مەرگێکی نامۆ «بۆ هەڵەبجە»

● **کامیران - عەتا وەلەدی**

لە شارەکەی شیعرو گۆران و پەڵە هەوردا
گوڵ لە شەتەکی شەو ئەدەن
پەنجەرەکان...
بەرەو مەرگێکی نامۆ ئەکرێنەوە
گڕو کلپەی تەنیایی دەستی لە ملمانەو
تابووت...
بۆتە سرەوتکەی منالانی دۆزەخ نەدیوو
سنگی شاعیر بۆتە وڵاتی سوورەو شەو
ئەفسانەی برسیەتی
ڕۆژێ نەبوو لەم وڵاتەش سنگی شاعیر هەڵنەدڕن
نوتەکان لە سەمفونی ڕەشی مەرگدا
ئاهەنگی تاعوون لێ ئەدەن
«ئەڵێم: بڕۆم لە شارەکەت»
کانگای خەم و ئازارەکەت
ئەڵێم بڕۆم



## داربەڕوو

بە یادی ئەمڕۆو دوا ڕۆژی هەڵەبجەی

ڕۆژێک تەنیا، ڕێبواری
ڕێگای سووتان بووم
ماڵێکی ڕەنجەڕۆی شاخ
و
بەندی دەواری گریان
بووم
ڕێگام بڕی
گەڕام
کەلار
گۆپکەی دەرکرد
زاری هۆنراوەی
بەسراوم
هاتە بەرهەم چلی درەختی
تا ساوم
زۆر شتم دی، دەمێک ڕامام
بەڵام، بەژنی لاوازی
داربەڕووی لاپاڵێکی
نیشتمانم کەوتە بەرچاو
بێ پیشەکی خۆم تێکەڵ کرد
بە
لق لقی بە ساڵا چووی
ئەو شادارە
ئازارە
پڕ
دڵ ئازارە
سەوزە گەڵای فرمێسکی ڕشت
خۆم ڕانەگرت، پرسیارم کرد:
ئەری، هۆ مەشخەڵی بڕیان!
سەرچاوەکەی سۆزی کوێستان!
کام تەوری دژ، چاوی تاوان
بۆتی هانی بەرگی خەزان!؟
لەو ڕۆژە وەی هەواری سووتا
و
گریان
خاک و خۆڵی گوند بە گوند
و
شار بە شاری نیشتمانی بەردە باران
بوو بە کێلگەو گڵکۆی باران
پەڕم نەما
سووتام
بڕژام
بۆیە وەها کز ئەنوێنێ
لق و باڵام، لق و باڵام...
ئۆمەری وەلەدووەگی



# تارای گیان

حەمە سەعید حەسەن

نیشتمان: نەهاژەی چەمە
نە لوتکەی شاخی بەفرینە
نە بەهاری داوێن سەوزە
نە پاییزی قژ زێڕینە
نە مێرگە نە دارستانە
نە یادگاری دێرینە
نیشتمان: نە شاری نوستووی
کۆشی دەشتە
نە دێی بەرۆکی چیایە
نە خزم و دۆست و ناسیاوە
نە دایک و خوشک و برایە
نیشتمان: ناخی ئینسانە
دەروونە، دووانەی وێژدانە
هەیە باخی دڵی بەرین
هەیە ناوەوە زیندانە
هەیە ناخی کەلاوەیە
هەیە گیای ئاوەدانە
نیشتمان: خودی مرۆڤە
هەستە، نەستە، دڵە، گیانە
نیشتمان: کۆرپەی ساوایە
چاوی کردووین بە جۆلانە
مەلێکی پیرۆزە کاسەی
سەری کردووین بە هێلانە
نیشتمان: دەڵێی لاولاوە
لە بەژنی تەمەن ئالاوە
نیشتمان: یارێکە شیرین
گەر سەرمای بێ
بە پێڵووی چاو
بە تارای گیان
دای دەپۆشین



# ئاورێک له ئەدەبیاتی مندالاّن

• ئەکبەر وەلەد بەیگی

«ژیانی راستەقینە کاتێ مانا پەیا ئەکات، بە دوای ئامانجو مەبەستێکی پیرۆز بێو ژیانیش ئەو دەمە شیرینە مرۆڤ بگاتە لوتکەی مراز - نووسەرێکی رۆژئاوایی»

پێشکەش بە:

لایەنگران و دڵسۆزانی زمان، ئەدەبو فولکلۆری رەسەنی کوردی و بە رۆحی هەمیشە زیندوی خوشکە «ژیلا حوسەینی» شاعیری ناسک خەیاڵی منداڵانی کوردستان. لەناو هەر میللەت و فەرهەنگێکدا، یەکێ لە بنەما بنچینەیی یەکانی فەرهەنگی ئەو کۆمەڵە، ئەدەبو وێژەیەو دەتوانین بڵێین پاشکەوتوویی و یان پێشکەوتویی هەر میللەتێک لە ئاوێنەی زمان و ئەدەبیاتی ئەو کۆمەڵەیدا بە روونی بەدی دەکرێ. ئەدەبیات خۆی دەبێتە چەن بەش و دەشــتی بەرین، کە یەکێ لەو بەشانەی مەخابن لە ئەدەبیاتی کوردی دا لەسەر رەف و قەفەسەکانی بیری نووسەران دانراوەو تۆزی لێ نیشتووە، ئەدەبیاتی منداڵان و لاوانی تازە پێ گەیشتووە.

لە سرنجێک بۆ سیاسەتی وڵاتانی جۆراوجۆری دونیا، بە تایبەت میللەتە پێشکەوتووەکان بە روونی ئەوەی بەدی دەکەین کە باسی بارهێنانی منداڵ و چاو لە فێرکردن و وڵامدانەوە بە نیازە جۆراوجۆرەکانی ئەم چینەی کۆمەڵ، یاسایەکی میللی یە و هەر بەڕاستی دەردی ئێمە لاوانی پێ گەیشتووی ئێستەی کوردەواری ئەوەیە کە لە منداڵی دا لە زۆر بواردا، بە تایبەت لە سەرەتای فیربوونا دەبێ بەش بووین و شاعیرە فارسەکە واتەنی:

هر که در خردیش ادب نکنند
در بزرگی فلاح از او برخاست
چوب تر را چنانکه خواهی پیچ
نشود خشک جز به آتش راست

باسی گرنگی ئەدەبیاتی زارەکی (شیفاهی) میللەت، سەرکەوتن، کاری چاکە، خاوێنی، مێرو وەفاو ئیمان و ئەوینە. مرۆڤی لاسار تووشی تاڵی و رەنجەرۆیی دەبێ و کەسایەتی ژیرو میهرەبان دەگاتە خۆشی و کامەرانی. هەموو چێتێک بەرەو دونیایەکی تەواو دوور لەچەوتی رێ دەکات. دونیایەک دوور لە دێوو شەڕ و خراپی و پیسی. ئەمە یەکێ لە گرنگترین تایبەتیەکانی دونیای حیکایەت و ئەفسانەیە کە لە ئەدەبیاتی زارەکی (شیفاهی) دا دەکەوێتە بەرچاو.

بارودۆخی ئێمە لە نووسینی چیرۆک و هۆنراوە بۆ منداڵان بارودۆخی ئەو بەچکە مراویەیە، پێم وایە کە بەسەرهاتتان بیستبێ. هێلکە مراوییێک لەگەڵ چەند دانە هێلکە مریشک دەنێنە ژێر مریشکێک، بەچکە مراویەکە لەگەڵ جوجەڵەکانی مریشکەکە دێتە دونیا، گاڵتە دەکات. دان و ئاو دەخوات ودەکەوێتە شوێنی دایکی و لە کاتێکدا کە هەموویان جیک جیک دەکەن، ئەو «بەق بەق» دەکات. هەرچی دایکی سەر دێنێ و دەیبا ولامی خۆی نادۆزێتەوە!! ئەمە چ دەنگێکە لە خۆت سازی دەکەی؟ بەڵام بێ بایەخ بوو. چونکوو بەچکە مراوی نەیدەزانی جیک جیک بکات، بەڵکوو «بەق بەق»ی دەکرد. پەنجەو دەمی مراوی بوو بە هۆی سەیر و سەمەرەیی دایک و خوشک و براکانی. تەنانەت هیچ کوێی لەشی مراوی لەوی دیکەی منداڵانی مریشک نەدەچوو، هەر ئەوە بوو کە رۆژ بە رۆژ پتر تەنیاترو بێ کەس‌تر دەبوو. ئەم پرسیارەی چەن جار لە خۆی کرد: راستی من بۆچی وام؟؟ بۆچی وەک ئەوانی دیکە نیم؟؟ جێگای من کوێیەو کاری من چی‌یە؟ بەڵام نەیدەتوانی ولامێکی باش بۆ پرسیارەکانی بدۆزێتەوە!! زۆر جار دەچوو لە گۆشەیەکدا کزی دەکرد و لەم بارودۆخەی خۆی بیرێکی قوڵی دەکردەوە! جارێکیان سەری هەڵبڕی و بەرەو ئاسمان و ئەستێرەکان چاوی گێڕا، سەیری هەورەکانی کرد، لە هەڵفڕینی پەلەوەرەکان مات و مەلوولی رایگرتبوو و ئامانجەکانی لە دڵیدا دەگاشانەوە. بەم جۆرە بوو کە رۆژێک کە خەریک بوو بە تەنیشت جۆگە ئاوێکدا رێگای دەبڕی، چاوی بە ئاوەکە کەوت، ئاوێکی پاک، خاوێن و زوڵاڵ، بەق بەتێکی کرد و چاوەکانی بە یەکا ناو هەڵفڕی و چووە ناو جۆگەکە. دای لە شەقەی باڵان و بەرەو پێش کەوتەرێ. شەپۆلی ئاوەکەیش یاریان دەدا. لێرەدا بوو کە لاقەکانی هەوڵیان داو بە فریای گەیشتن. هەروەک بێلی لۆتکە (پارۆی قایق) ئاوەکەیان لا دەداو بەچکە مراوی دەچووە پێش. لەم حاڵە دا مراوی زۆر خۆشحاڵ بوو و دەستی کردە خواردنی گیاو سەوزی ناو ئاوەکە. پاش ماوەیەک هەڵفڕی، هەڵفڕینێک زۆر کورت، بەڵام دڵڕفێن. سەرەڕای ئەم گشت خۆشی‌یە، مراوی تووشی تاڵی، بوسیەتی، ون کردنی رێگاو ترس و لەرزی زۆر بوو. لەگەڵ هەموویان ژیرانە خۆی پێک‌دەهێنا، بەڵام ئێستا بوو کە بە تەواوی گەیشتە ولامی پرسیارەکانی! چونکوو مراوی ئەو پەلەورە بوو کە خواوەندی مەزن ئەوی بۆ مەلەی ناو ئاو و هەڵفڕین بۆ ئاسمانی دوورە دەس خوڵقاند بووی نەک بۆ جیک جیک و تووکەی ناو خاک و خوڵ.

پێم وایێ بیرو را و بارو دۆخی ئێمەش بۆ نووسین، لە بۆ چینی منداڵان چێتێکی وەها بێ. وا باش دەزانم کە لە پێش دا ئاماژەیەک بکەمە، پێش وتارێکی کورتی مێژوویی:

یەکەمین کۆکراوە لە حیکایەتەکانی خەڵک و ئەفسانە جۆراوجۆرەکانی جن و پەری، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی «رۆمانتیسم» (Romantisme)[۶]. ئەم دەسکەوتە هێشتاش هەر لە ناو دڵی خەڵکدایەو هەر سەرچاوەشە. هەتاکوو دەس پێکردنی شەڕی یەکەمی جیهانی، واتە ساڵەکانی (۱۹۱۸-۱۹۱۴ز)، بزاڤی ئەدەبی تایبەتی منداڵان لە لایەن بەڕێز، «وڵگاست»ی ئوتریشی‌یەوە لایەنگری و هاوکاری دەکرا. دەبێتە هۆی چاپ و بەدیهاتنی کتێباتێکی زۆر هەرزان و لەباری ئەدەبیەوە زۆر پڕ بایەخی ویچراوە. زانیاری بۆ منداڵان کە لە ساڵی (۱۹۳۷ز)دا، دێتە دی، دەستە کتێباتێکی زۆر پڕ بایەخ و پیرۆزن کە پتر باسەکانیان لەسەر لێکدانەوەی ژیانی مرۆڤ و باس لە رۆح و ئیلهام بۆ بابەتەکانی پاش ئەم ساڵانەن. دوای شەڕی دووهەمی جیهانی، واتە ساڵەکانی (۱۹۵۵ - ۱۹۴۵) کتێب و وتارگەلێکی زۆر تایبەتی، بەڵام دوور لە ئەخلاق دێنە ناو خەڵک. لەو کەسانەی کە لەم بابەتەدا تووشی زەحمەتی زیاتر بوون، دەتوانین ئەم هونەرانە ناوبەرین «فریتس هابک - مارلن هو سوند - کریستین بوستاو کارل هاینریش)، کە جارجاریش چتانێکی کورتیشیان دەنووسی بۆ منداڵان. لە ساڵی (۱۹۶۰ز) دا بەم لاوە زۆربەی باس و پەیامی نووسراوەی منداڵان دەبێتە ئامانجێکی پیرۆزی مرۆڤ وەک «هەست کردن بە خۆشی و کامەرانی لە ژین» و هەروەها بابەتێکی بارهێنانی و فێرکاری واتە لەم سەردەمە کورتە بەم لاوە: ئێمە سێ جۆر کتێبمان هەیە بۆ منداڵان لەگەڵ وێنە:

یەکەم: ئەو کتێبانەی کە یەکسەرە تایبەتین و زیاتر باسیان لەسەر لێکدانەوەو وێنانێکی تایبەتین.

دووهەم: ئەو کتێبانەی کە «گشتی»ن و باوی دڵی خەڵکن.

سێهەم: ئەو کتێبانەن کە بۆ چینی ناسک خەیاڵی منداڵان نووسراون و پێشکەش کراون.

لەو نووسەرە پایە بەرزانەی کە نازناوی جیهانیان هەیە دەتوانین کەسانێک وەک «ماریاتوزیەو شهرگنر» ناوبەرین کە لە واقیعدا ئەم کەسانە هەڵگری ئاڵای رەسەنی (سونەتی) سەردەمێکی بەر لە خۆیانن کە باسم کردن. بەڵام لەو دەمەش بەم لاوە نووسراوەی منداڵان دەچێت بەرەو پەخشان و دونیایەکی خەیاڵی و رۆحی و باسی ناڵەبارییەکان

و داگیرکردنەوەی کۆمەلایەتی و ... کە هێشتاش هەر درێژەی هەیە. ئێستەش چاوێک لەم بەشەی هونەر لە کوردستانی مەزن، لە نیشتمانماندا بەداخەوە ئەم بەشەی ئەدەبیات وەک بەشەکانی دیکەی هونەر، بەڵام زیاتر لەوانە زوڵمی لێ کراوەو زۆر بەداخەوە هێشتاش ئێمە لەم بەشەدا نەمانتوانیوە بگەین بەو سنوورە جوانانەی کە منداڵانی ناسک خەیاڵ، ڕەزا شیرین و خۆشەویستی کۆمەڵەکەمان چاوەڕوانی ئێمە دەکەن. هەڵبەت شتێکی زۆر ئاسایی و سروشتی یە کە هۆی سەر پاکی ئەم گیرو گرفتە دەگەڕێتەوە بۆ تەنگو چەڵەمەکانی فێرکردن و ئەمە کە منداڵی خوێنەواری ئێمە لەسەرەتای سەردەمی خوێندن دا چی دەخوێنێ. لە مەکتەب دا بە چ زمانێک رادێ (فێر دەبێت)، خوێندنی کوردی گرفتی هەرە گەورەی زۆربەی لاوانو کورو کچانی خوێنەواری کوردستانە کە بەداخەوە نازانم چۆن خۆیان بەوەی رازی و قانع دەکەن کە حەز لە زمانی دایکی خۆیان ناکەن، ئێمە هونەرانێکی زۆر مەزن و پایەبەرزمان هەیە کە توانیویانە هەرچەن کەمو کورت خزمەتێکی گرنگ کەن بەم چینەی کۆمەڵ کە لە دونیای خەیاڵو بیری داهاتوودا دەژین، دڵسۆزانێک وەک «پاشارکەماڵ» کە ناوبانگی جیهانی هەیەو هەروەها کاک «ئەنوەر موحەممەد»، کاک «غازی خەلیلی» و خوشکە «ژیلا حوسەینی» رەحمەتی کە چاو چرای دونیای جوانی منداڵان بوونو زۆربەی ئازیزانی دیکە کە من تەنانەت ناویشیان نازانم، بە هیوام کە گشتمان لەمە زیاتر چاو لەم بۆشایی یانە کەین و بتوانین بۆ منداڵانی ئازیز بە هەر جۆرێک و لە هەر بەشێکی ئەدەبیاتدا بووە هەنگاو هەڵگرین. ئینجا درێژەی باسەکە:

## ئەدەبیاتی منداڵان لە چەن بەشو بەرهەم دا خۆی دەنوێنێ:

١) کتێبە جۆراوجۆرەکانی منداڵان. ٢): سازکردنی فلیمانی (ئەنیمەیشن) بۆ چینی منداڵ. ٣)شانۆ. ٤) کارتۆن و فلیمی تایبەتی منداڵان. ٥) شیعرو وتاری جوان . ٦)مۆسیقاو شریتی تایبەتی ئاکاری گرنگی «وێنەکێشی. ٨) جێگای باس دەبێتە حیکایەت کە بۆ منداڵان بەشێکی زۆری دەشتی بیریان دەگرێتە بەر. بە جۆرێکی ئاسایی هەر حیکایەتێک، چیرۆکێکی پڕ لە بەسەرهاتەو دڵ تەزێن، یان پێکەنینی و خەیاڵیە. حیکایەت زۆر شێوازێکی سادەو جوانی هەیە، دوور لە تول و پێچەوانەو ناحەزی زمان و لەگەڵ پێگەیشتنی بابەتانێکی زۆر ئاسایی‌دا دێتە دی.

کەسایەتیەکان (ئەکتۆرەکان)ی حیکایەتی منداڵانە: گیان لەبەر یان ئینسان یا هەر زیندەوەرێکی دیکە، بۆ باسو لێکدانەوەی زیاتری چیرۆک و دەرخستنی مانای ئەو چیرۆکە هەر یەک بە جۆرێ دێنە دی و باسیان دەکرێ. تەنانەت بارودۆخی رواڵەتی (زاهیری) کەسایەتیەکانی چیرۆک دەتوانێ زمانی فەرهەنگی ئەو جێگایە بێ کە چیرۆکەکە تێیدا ساز کراوە. مرۆڤگەلی باشو خراپ، مێهرەبانو دڵڕەق، ژیرو گێل هەموو بە جۆرێکی بەرچاو دێنە گۆڕێ. داب و نەرێت و روسوومی باس کراو لە چیرۆکەکە خۆی زمانی سەرچاوەی چیرۆکەو دەتوانێ پێمان بڵێ کە لەو کۆمەڵە دا چی باوەو چی یاسایە. مێهرەبانی، خۆشی، هاوبەشیو یارمەتی، ئەخلاقی جوان و ژیرانە، خۆشەویستی، ماڵ و پارەی زۆر و ئاسایشو ئاسوودەی ئەمانە گشتیان وشانێکی خۆشەویستن و



دەتوانن خەڵات وەرگرن و گێلیو درۆ و خەیانەت و نەفامیو فێڵ و تەڵەکەو خراپی و دڵ رەقی هەموویان سەرچاوەی ناحەزی و رەنجەڕۆیین و دەبنە هۆی گێچەڵ و ئێش و ژان بۆ ئینسان. زۆر جار بۆ باسی چیرۆکو دەرخستنی مانای واقیعی حیکایەت، مرۆڤ دەبێ دەسەڵاتێکی نرەو ئاسۆی بیری رووناک. ئاسۆ و لوتکەی هەر چیرۆکێ وەک ئەوەی کە لە حیکایەتە کۆنەکانو ئەفسانەکاندا هاتووە، وانیە کە بێ سێو دوو دەبێ باسێکی خۆشو بەسەرهاتێکی خۆشەویستانە بێت. بەڵکوو زۆر جار چیرۆک دەبێتە تیراژدیێک، دەبێتە زمانی لاڵی میللەتێک، دەبێتە دووچاوی فرمێسکاوی هەتیوێکی منداڵ و خوێن دەڕێژن.

ئێستاش دێینە سەرباسی سەرچاوەکانی چیرۆک: سەرچاوەی چیرۆکەکان دەگەڕێتەوە بۆ رۆژگارانی پێشوو. دەگاتەوە بۆ رۆژگاری منداڵی مێژووی مرۆڤ. لە سەدەی نۆزدە دا بەشێک لە هونەران و نووسەرانی بەناوبانگ رایانگەیاند کە تەواوی چیرۆکەکان لە یەک دەسەو باسێکی تێکڕاوە دێنە دی و سەرچاوە دەگرن. بەشێک وڵاتانی میسرو هیند بە سەرچاوەی گرنگی فەرهەنگی میللەتانی هیندو ئەورووپا دەزانن. بڕێک لە رۆشنبیرانی چیرۆکنووس باوەڕیان وایە کە: بودائیەکان، هیندیەکان، عەرەبەکان و رۆمیەکان و ... سەرچاوەی یەکگرتووی باسە جۆراوجۆرەکانی حیکایەت و ئەفسانەکانی دونیان.

باسی جۆرەکانی چیرۆک:

ئەلف) چیرۆک بۆ منداڵان لەگەڵ ئەکتۆران (کەسایەتان)ی رەنجەڕۆو داماو.

ب) چیرۆک لەگەڵ کەسایەتیانی قارەمانو لێهاتوو.

ج) چیرۆک لەگەڵ پرسیاری «بۆچی»؟ بە تەواوی باس دەکەن.

د) چیرۆکی منداڵانە و پڕ لە پێکەنین و گاڵتە.

بە هیوام هەر ئازیزێک لەم وڵاتە دا دەیەوێ خامە هەڵگرێت و بۆ منداڵان بنووسێ چاوی لە واقیعیەتی زانستیەکانی ئەم هونەرە کات، کارەکەی لە رووی یاساییێکی باس کراو لە کتێبە تایبەتیەکاندا بێت، واتە بافتی عیلمی هەبێت. پارچە شیعرێک پێشکەش بە منداڵانی ئازیز، بۆ ئەو کەسانەی لای من و دیکەی هونەرانی دونیای خۆتان مەزنو گرنگو ئازیزن. هیوام بە دڵتان بێت و ئەم کورتەش شایانی ئەوەی هەبێت. بەداخەوە ئازیزەکانم ئەدەبەکەتان خراوەتە پشت گوێ! چونکوو ئەو بەرهەمانەی کە بۆ ئێوەی خۆشەویست، زارۆکانی ئەمڕۆ و نەوەی داهاتوومان نووسراون، بە پەنجەی دەست دەژمێدرێن. کاک ئەنوەر موحەممەد «واتەنی ئێوەش مافی ئەوەتان هەیە لچێک هەڵبتورچێنن، پەنجەی ناسکتان خەرنە ژێر چەناگە، یان سەر لاجانگتان بیرکەنەوەو بڵێن: بۆچی ئەدەبی ئێمە (منداڵان) بایەخی زۆرتری پێ نادرێ و کێ تاوانبارە»؟

## یاری

وەرن وەرن منداڵان
یادێکەن لە کۆڵانان
یادێکی ئاسان و خۆش
بە پاڵتا بە بیرو هۆش
هەڵگرین یەکێ دارێ
بۆ مەبەست لە نیشانێ
تێکۆشین بە بیرو هۆش
لابەرین سنوری بۆش
ئەو جێیانە گورگی دوور
ناوی لێناوە سنوور
لەسەر زەوی بەردەهان
لەناو خۆڵی وڵاتان



دڵنیام ئەم کورتە نووسراوە ئاورێکی زۆر کورت بێت لە دەشتی بەرینو بەربڵاوی ئەم بەشەی ویژەو ئەدەبو بە هیوام بە چاوانێکی تیژترو رووناکبینتر، بە دڵێکی گەرم و بەتینتر، دەست و قەڵەم رێک خەین و نادیارەکانی ئەدەبیاتی ئەم چینەی کۆمەڵمان خەینە بەرچاو و قەت لە بیر نەکەین کە منداڵانی ئەمڕۆ پیاو و ژنانی سبەینێن. هەر جۆر باریان بێنین وەها بار دێن و کەسایەتیان رەنگ دەگرێ.

* - شێوەو بیری نوێ لە چیرۆکنووسین دا، کە لە سەرەتای سەدەی (١٩) دا لە وڵاتانی فەرانسە و ئینگلیس دا دێتە دی و بەم جۆرە ئەدەبیاتی کلاسیک دەتێە لاوەو پەنا دەبەنە دونیایەکی نوێ.

### سەرچاوەکان:


١. مجموعۀ پژوهشی «پویش»، سال ١٣٦٢، تهران.
٢. سلطان فیلها، یشار کمال.
٣. زێبین، ئەنوەر موحەممەد، شیعرەکەیش هی ئەوە.
٤. قصەهای مجید، هوشنگ مرادی کرمانی.
٥. ادبیات کودکان، جمعی از نویسندگان.
٦. کۆڤارە جۆراوجۆرەکانی ئەم باسە.

**«چیرۆکیکی فۆلکلۆرییە بۆ منالأن**

• بۆکان – ئامادەکراوی عەلی گوڵی



خاڵە حەمە و سۆفی کەریم ڕۆژێ لە ڕۆژان، باسی رابردوویان دەکرد، خاڵە حەمە پیاوێکی بە ساڵا چووە، زۆر قسە خۆشە، مژێکی لە سیگارەکەی داو یەک دوو جار کۆخی، هەناسەیەکی هەڵکێشا، وتی:

«هەتا لاو بووم فرە پیر نەبووم، /دەمکرد راوی باز، سۆنە گیر نەبووم – ئیستاکە پیرم من ئەگرم سۆنە / سۆنەش سڵ ئەکا لە داوی کۆنە». کورە تاکوو لاو بووم، خۆ شەو و ڕۆژ بۆ من وەک یەک وابوو، نە ڕۆژ ماندوو ئەبووم نەشەو، تا بەیان نەخەوتایەم، بە بای خەیاڵمدا نەدەهات. ئاخ پیری! بە خوا ئەو زەمان پیاوی ئاغا بووم، دەمەو بەهار شەڕە کەڵ باو بوو، تازە خاوی کەڵ و گایان دەشکاند.

ڕۆژێک ئاغا بانگی کردم، وتی حەمە ئەگەر کەڵەکانت ئەم بەهارە لە شەڕ دا نەبەزن. دەستێکت کەواو پاتول خەڵات دەکەم. منیش چوومە درگای مزگەوت، وتم: کێ حازرە بۆ شەڕەکەڵ؟ کەڵی خۆی بێنێتە مەیدان.. عەولای حاجی وتی: ئەمن حازرم، سبەینێ ئەو ڕۆژە، تازە تاووبان گەرم دەبوو، لە پشت قەڵای ئاوایی شەڕەکەڵ ساز بوو. دوای هێندێ بێنەو

بەرە، کەڵی ماڵی حاجی بەزی، دەم لەسەر پشت هەڵات، کەڵی ئاغا کەوتبووە سەری، وڵاتی لێکردبووە چەرمە چۆلەکە، دوو سێ دەوری بە نێو ئاواییدا سوڕاندەوە، کەس نەیدەتوانی لێکیان بکاتەوە، بەسەری ئەو سۆفی کەریمە کە هەرام کردێ کلکی کەڵی ئاغام گرت، جووڵەم لێ بڕی. بەڵام پەنجەی لاقم لە کلاشەکەم هاتنە دەرێ، سۆفی کەریم لە قاقای پێکەنینی داو وتی: خاڵە وا دیارە تۆ لە تایەفەی «گوێ ڕەشی!»

خاڵە حەمە بە سەرسوورمانەوە گوتی: گوێ ڕەش چیە؟!

سۆفی کەریم گوتی: هەی ماڵتە چۆن ئەو پەندە خۆشەت نەبیستووە؟ ئەو پەندە بۆ کەسێک دەگوترێ، ئازا و بوێرو کارزان بێ. پەندەکە ئاوایە:

دەڵێ: ڕۆژێ گورگێکی پیر زۆری برسی دەبێ، هەروا بە بێ وازی دەڕۆیشت، تووش دەستەیەک گورگ دەبێ. وتیان: مام گورگ چۆنی، بۆ وا بێحاڵی؟ وتی: حاڵم زۆر خراپە، وەختە لە برسا بمرم؟

- خەم مەخۆ هەر ئێستا دەچین بۆ قاوەتوون، پێخۆرێکی باشت بۆ دەهێنین.

ئێوە لە کام تایەفەن؟

- لە تایەفەی گەدەفش.

- بڕۆن، بەسەر چاو، بەڵام هیوام پێتان نیە.

ڕۆیشتن تووشی کەرکە مەڕێک بوون، هەر کە نزیک بوونەوە، سەگی شوان کەوتە سەریان بە هەزار چەرمە سەری، دەرباز بوون.

گورگی پیر ئەمجار تووشی ڕەوە گورگێکی تر بوو. دوای سڵاو و چاکی و چۆنی، گوتی: زۆرم برسیە فریام نەکەون لە برسا دەمرم.

- وتیان: بە سەرچاو هەر ئێستا دەکەوینە خۆ، بۆ نەهار میوانی ئێمەی.

- ئێوە لە کام تایەفەن؟

- لە تایەفەی گوێ زەردین.

- بڕۆن، بەڵام هیوام بە ئێوەش نیە.

ڕۆیشتن دیيان وا مێگەلێک لەبەر قەدی کێوێک پەڵی هەڵخستووە، هێستا نەگەیشتبوونە نزیک مەڕەکان سەگگەل لێیان دەرپەڕین و هەر یەکەیان بە لایەکدا هەڵبڕین.

گورگی پیرزگی لە برسا هەر قوورەی دەهات، کەوتە چاوەڕاو، لە دوورەوە دەستەیەک گورگی دی، هەر چۆنێک بوو خۆی گەیاندە لایان. وتی: زۆرم برسیە خزمینە، فریام کەون.

وتیان: بەسەرچاو ئەم شەو بۆ شام میوانی ئێمەی.

- ئێوە لە کامە تایەفەن؟

- لە تایەفەی گوێ ڕەش.

- هەر بژین، لە بەیانیەوە چاوەڕوانی ئێوەم، بڕۆن بزانم چ دەکەن. ڕۆیشتن دیتیان ڕانە مەڕێک دەلەوەڕێن، چەن گورگ پەلاماری مەڕیان دا، شوان و سەگەکانی کەوتنە سەریان زۆریان لە مێگەلەکە دوور خستنەوە. لەوکاتە دا چەن گورگی تر دەرپەڕین و نێو مێگەل کەوتن، کابرایەکی جووتیار کە جووتی دەکرد، چاوی لێ بوو، گایەکانی بەجێهێشت و چوو بۆ یارمەتی شوانەکە کە دوور کەوتەوە ئاوری داوە چەن گورگ گاکانی ئەویان هەڵدڕیوە، کابرایەکی چەرچی کە هەلووچەی پێ بوو، گوێدرێژو بارە هەلووچەی بەجێهێشت و هەڵات تا گاکانی جوتیار نەجات دا کە ئاوری داوە. دوو گورگ گوێدرێژەکەی ئەویشیان خنکاندووەو بارە هەلووچە بڵاو بۆتەوە. هەوا تاریک ببوو. گورگەکان گەڕانەوە لای گورگی پیر، وتیان: ئێستا بۆ شام میوانی ئێمەی، هەرچەندە ئیشتیات دەبا بخۆ. گورگی پیر وتی: چیتان هەیە؟ وتیان: گۆشتی گا دەخۆی هەیە، گۆشتی مەڕ دەخۆی هەیە، گۆشتی گوێدرێژ دەخۆی هەیە، جارجارەش بۆ فێنکی دەروون و مەزەی ترش هەلووچەش دەخۆی هەیە.





# بەسەرهاتی وشتر سوار و مار و ڕێوی

• وەرگێڕاوی سەعدوون ڕادمەنیش

لە کتێب و نووسراوەکانی هیندی دا هاتووە کە کابرایەکی وشتر سوار بە ڕێگایەکدا دەڕۆیشت، گەیشتە جێ یەک کە کاروان لەوێ باریان کردبوو و ڕۆیشتبوون، جێ ئاوری کاروان مابووەوە، بڕێک سووتەمەنی یان لێ بەجێ مابوو، با ئاوری نەکوژاوەی گەشاندبۆوە، سووتەمەنی ئاوری تێبەر ببوو. لە نێو ئاورەکەدا مارێکی درێژ تەفی خواردبۆوەو ڕێگای دەربازبوونی نەمابوو.

کابرا پیاوێکی لە خودا ترس بوو، نەیتوانی شایەتی سووتانی مار بێ، هەر بۆیەش توورەکە پێ‌خۆرەکەی هەڵرشت و بەسەر لکی دارێکی داکردو ڕایداشتە نێو ئاورەکە، مارچووە نێو تووره‌کەکەوەو کابرا توورەکەکەی هێنا دەرێ، ماریش کە گیانی نەجات درابوو لە توورەکەکە هاتە دەر. لەپیاو هاتە پێش و گوتی:

«تۆ کاری چاکت کرد، بەڵام ئەمن دوژمنی تۆم، دوژمنایەتی ئێمە لەگەڵ ئادەمیزادە لە مێژینەیە، دوژمن بە دۆست گرتن لە پیاوەتی بە دوورە، یان بە تۆوەدەدەم یان بە وشترەکەتە وەدەدەم.»

پیاو گوتی: «ئەمن دەرحەق بە تۆ چاکەم کرد، ئاوا جوابی چاکەم دەدەیەوە؟»

مار گوتی: «دەخوازی بۆ ئەو گوتەیەت شایەت و بەڵگەت هەبێ؟ چاوی لە دەوروبەر کرد، گامێشێکی دی کە دەلەوڕێ، چووە پێش و گوتی: «ئەی جەنابی گامێش پرسیارێکم هەیە، تۆ بڵێ بزانم جوابی چاکە خراپەیە؟»

گامێش وەڵامی داوە: «بەڵێ، بە حیساب و کیتابی ئادەمیزاد، جوابی چاکە خراپەیە، ئەمن لە خزمەتی ئادەمیزادا بووم، هەموو ساڵێ بێچوویەکی جوانم دەبوو، ماڵیانم پڕ لە ڕسق و ڕۆزی کردبوو. ئەو کاتە کە پیر بووم و لە زاو زو کەتم، چیوارو قەسابی کردە سەرم تاکوو بمفرۆشن و گۆشتەکەم بخۆن، ئەو هەموو خزمەتەی ئەمنیان وەبەرچاو نەهات، جوابی چاکەیان بە خراپە دامەوە!!»

مار ڕوی کردە پیاو و گوتی: «گوێت لێ بوو؟»

پیاو گوتی: «شەرع شایەتێک بە تەنیا قەبووڵ ناکا»

مار سرنجی دا دەورو بەر و دارێکی گەورەو پڕ لقی دی، چووە نزیک و گوتی: «ئەی داری پڕ لق و پۆپ، چ دەڵێی؟ جوابی چاکە خراپەیە؟»

دار وەڵامی داوەو گوتی: «لە ئادەمیزاد هەر ئەوەم دیتووە، ئەمن دارێکم لەو دەشتە، لە ژێر سێبەرم دەحەسێنەوە، پشوو دەدەن و پاشان فکری خراپ دەکەنەوەو دەڵێن: «لە دار تیری چاک، تەختەی چاک و دەرگای چاک دروست دەبێ، دەچن تەور دێنن و هەموو سەرو گوێم لێ دەکەنەوە، جوابی چاکەی من ئاوا دەدەنەوە!»

مار گوتی: «دوو شایەتمان دی، وەرە پێتەوەدەم!»

پیاو گوتی: «شایەتی سێهەم دەبێ قازی بێ و نێونجی بکا!»

ڕێوی یەک لەو نزیکانە خۆی مات دابوو، کەم تا کورت لە چەندو چوونی مەسەلە ئاگادار بوو، لە پەنا هاتە دەرو خۆی نیشان داو خۆی گێل کرد.

پیاو و مار لە ڕێوی چوونە پێش و لێ یان پرسی: «کاکە ڕێوی ئەتۆ بڵێ بزانم جوابی چاکە خراپەیە؟»

ڕێوی وەڵامی داوە: «ئەی پیاو تۆ چ چاکەیەکت لەگەڵ ئەو مارە کردووە؟»

پیاو گوتی: «ئەو مارەم لە نێو ئاور و لە سووتان نەجات داوە»

ڕێوی گوتی: «چۆنت مار لە نێو ئاور هێناوەتە دەر، ئەمن ئەو قسەیە باوڕ ناکەم.»

پیاو گوتی: «توورەکە پێ خۆرەکەم بەسەر لکی دارەوە کرد و درێژم کردە نێو ئاورەکە، مار چووە نێو توورەکەوەو منیش هێنامە دەرەوە.

ڕێوی گوتی: «ئاخر ماری ئاوا درێژ لەو توورەکە چکۆلەیە دا چۆن جێ دەبێتەوە؟ ئەگەر ڕاست دەکەن توورەکە بێنە تاکوو ئیمتیحانی بکەین.»

بەو جۆرە ڕێوی توورەکەی هێنا، ماریش کە زۆر غەڕ ببوو، چووە نێو توورەکەوە، ڕێوی زارکی توورەکەی بەست و ڕووی کردە پیاو و گوتی: «ئەی پیاو، نەغدی خۆت مەدە بە قەرز، وەختێک دوژمنت گرت، مەیەڵە دەرچێ، ئەگەر دەرچێ خۆت دەکەوی یە گێرەوە!»

پیاو کە ئەوەی بیست، توورەکەی ئەوەندە لە عەرز دا تاکوو مار تۆپی.

# شیعری ئەمڕۆی یۆنان

• وەرگێڕ لە فارسییەوە بۆ کوردی: شێرکۆ جیهانی



«یانیس ریتسوس» شاعیری یۆنانی، خاوەنی کۆمەڵێک شیعرە بەناوی «گۆرانی‌یەکانی ئیشتیمانی رەنج». ئەم شاعیرە یەکێک لە گەورەترین شاعیرانی یۆنانە. هەروەها، شاعیرێکی تر بەناوی «یاکووس کامپانێل لیس» کە خاوەنی کۆمەڵێک شیعرە بەناوی «ماوت هاوزین».

ئەم دوو شاعیرە یۆنانی‌یە دوو دەورەی پڕ لە رەنج و تاڵی مێژووییان بە چاو دیتووەو شیعرەکانیان لەم دەورانە دا پەروەردە کردووە. یەکەم دەورە؛ لە کاتی هێرشی فاشیستەکانی ئاڵمانی بۆ سەر یۆنان دەست پێ دەکات‌و تا ساڵی ١٩٤٥ دەخایەنێ. دەورەی دووەم؛ ساڵەکانی ١٩٦٧

تا ١٩٧٤ ئەگرێتە بەر. ئەم ساڵانە بە هۆی هاتنە سەرکاری سەرهەنگەکانی کودێتاچی لە یۆنان، ڕەش و تاریکترین ساڵەکانی خەڵکی ئەم وڵاتە بوون.

بۆ ئاگاداری باشتر بەر لە هەموو شتێک لە دەورەی یەکەم دەدوێین.

لە فەرهەنگی رامیاری دا وشەکانی «توتالیتار»و «توتالیتاریسم» بەم واتەیە هاتوون.

«توتالیتار» بەم ڕێژیمانە ئەگوترێ کەخاوەنی ئەم تایبەتمەندییانەن:

یەکەم: چاوەدێری ڕێژیم لەسەر تەواوی کردەوەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی و لەناوبردنی هەموو جۆرە ئازادییەک (ئازادی کەسایەتی، یان ئازادی کۆمەڵایەتی). هەروەها لە چنگ گرتنی هێزی رامیاری و نیزامی بە دەس پارتییەک کە هاتۆتە سەر کار، بە جۆرێک کە تەنانەت پارتەکانی تر بە دەستی وان سەرکوت بکرێن... هەروەها، کەڵک وەرگرتن لە ڕەشەکوژی بۆ لەناو بردنی ئەو کەسانەی کە بیروڕایان لەگەڵ ڕێژیم یەک نیە. ڕێژێمێکی توتالیتاریستی، زانستی خەڵک لە رادەیەکی کەمدا رادەگرێ و تەنانەت لەسەر کردەوەکانی ئەدەبی و هونەری و شتو مەکەکانی تر وەکو شەمەندەفەر، فرۆکەو رادیۆ... چاوەدێری دەکاتو تەواوی توانایی خەڵک وە خزمەت خۆی ئەگرێ. زۆربەی ڕێژیمەکانی «توتالیتاریستی» بە دەست جوڵانەوەکانی کۆمەڵی دژی ئازادی پێک دێن کە لە پێش دا بە شێوەی پارتییەک، لەناو ڕێکخراوێکی ئازادی پەسەند، خۆ نیشان ئەدەنو پاش وەیکە دەسەڵاتی حکومەتیان وەچنگ هێنا، ئاگری ئازادی ئەکوژێننەوەو ئازادی خوازان لە سێدارە ئەدەن. ئاشکراترین وێنە لەم جۆرە ڕێژێمانە پارتی سۆسیال ناسیونالی ئالمان بە رێبەرایەتی هیتلێر بوو کە لە پێش دا، بە شێوەی پارتییەکی پاک و ئاشتی خواز خۆی نیشان داو لە پاش هەڵبژاردنو سەرکەوتنیان لە ئالمان، ڕوچکی فاشیستی و درندانەی خۆیان وەدیار خست.

یاران و پەیرەوانی هیتلێر بۆ لەناوبردنی ئەو کەسانەی دژ بەوان رادەوەستان و هەروەتر بۆ گەیشتن بە ئامانجی کەڵک وەرگرتن لە جۆرێک کۆیلەداری نوێ، بە داگیرکردنی وڵاتانی ئوروپایی ئاکارێکی سەیرو ناحەزیان لە خۆ نیشاندا کە لە مێژووی پەستی و درندایەتی کەم وێنەیە.

نازییەکانی هیتلێری، ئەیارەکانیان کە بریتی بوون لە کۆمۆنیستەکان، جوولەکەکانو خاوەن بیرو باوەڕەکان بەهاوڕێی دیلەکان دەبردە ئۆردوگاکانی کار، یان مەرگ... زۆربەی ئەم ئۆردوگایانە لە شوێنەکانی دوورکەوتوو بەشێوەی بێگاری کێشان لە دیلەکان پێک دەهاتن. لە راستی دا، هەر ئۆردوگایەک کوشتارگایەک بوو، هەر زیندانییەک تاوانبارێک بوو کە بەر لە چوونی بەرەو ئۆردوگا، فەرمانی کوژرانی درابوو.

کاتێک شەمەندەفەرێک ئەگەیشتە ئۆردوگا، پزیشکی «ئێس ئێس» چاوی لە لاشەی هەر یەک لە زیندانییەکان ئەکرد. بەم شێوەیە کە بە زیندانیان دەستور ئەدا، ڕێگا بڕوات، ئەم ڕێگە ڕۆیشتنە زۆر جاران چەند حەوتویەکی خایاندووەو دیل ماندوو مردو ئەگەیشتە ئەنجام. ئەوسا لە ڕووی شێوەی ڕێگا ڕۆیشتن... پزیشکەکان بیروڕای خۆیان دەرئەبڕی کە ئایا ئەم دیلە توانای کارکردنی هەیە یان نا؟! ئێنجا ئەو کەسانەی توانای کارکردنیان نەبووایە، لەگەڵ منداڵان و پیرەکان بە بیانۆی خۆ شوشتن ئەیان ناردنە ناو دیوەکانی گاز. ئەم دیوانە بۆ فریو دانی دیلەکان خاوەنی چەن ڕیز دۆش بوون و زیندانییەکان بەر لەوەیکە بڕۆنە ناو ئەم دیوانە، ڕووت ئەکرانەوە. ئەم جل و بەرگانە (کە خاوەنەکانیان زۆرتر زێڕ و شومەکی پڕ بایەخیان تێ دا شاردبۆوە) لە پاش مەرگی دیلەکان، فاشیستەکان دەستیان بەسەر دا دەگرت.

یەکێک لە ئاژاوە گێڕانی مرۆڤکوژ بەناوی «ڕۆدێلف.فرانتیس هوئیس R.f.Hoess کە سەرپەرستی کوشتارگای «ئاوش ویتس»ی بە ئەستۆوە بوو، لە پاش دوایی هاتنی شەڕ، بە تاوانی لەناوبردنی دوو ملیۆن و پێنج سەت کەس لەم ئۆردوگایە لە سێدارە درا.

ئەم مرۆڤە نامرۆڤە لە دادگای «نۆرێن بێرگ» دانی بەسەر زۆر شتاندا ناو وتی.

لە کوشتارگای «ترێبلینکا» دیلەکانیان لە دیوەکانی دوو سەت کەسی دا رادەگرتو دەرگاکانی ئاسنیان لەسەر دادەخستن. ئەوسا بە هەڵ کردنی ماشێنەکانی خۆیان، ئەم دوو کەڵ و گازەی کە بەرهەمی سوتانی بەنزین و ڕۆن بوو، لە لولەکانی تایبەتی کە بەرو ژووری دیوەکان کێشرا بوون، تێ پەڕ ئەبوون و ئەچوونە ژوور)... ئێنجا پاش سێ دەقان دەرگاکانمان ئەکردەوە. کۆماندۆکان، ئەنگوستیلەو ددانەزێڕەکانی مردووەکانیان کۆ ئەکردەوەو کاری سوتاندنی لاشەی مردووەکانیان دەست پێ دەکرد. ئۆردوگای ئێمە هەر کەڕەتێک، دووهەزار کەسی گازخۆر ئەکردو ئەیکوشت».

ئەو زێڕانەی کە لە ددانی مردووەکان وەدەست فاشیستەکان دەکەوت لە کارگاکانی ناو زیندان و بە کەڵک وەرگرتن لەکارو زانستی کۆمەڵێک دیلی کارناس، ئەتواندرانەوەو ئەکرانە شمش و بەرەو پارەخانەی رایش (بانکی هیتلێر) ئەناردران، هەندێ لە شایەدەکان لە دادگای «نۆرێن بێرگ» شایەدییان داوە کە لە پێش دا، خوڵەمێشی لاشەی قوربانییەکان بە ماشێنی باری هەڵئەگیراو ئەرژایە ناو چۆمی «زۆلا -sola »، بەڵام دوایە بۆ پێکهێنانی کود کەڵکیان لێ وەرگرت و سەرچاوەیەکی پڕ لە داهاتیش بۆ فاشیستەکان بوو. هەروەتر بە پێی بەڵگەی دادستانی رووسی ئەم دادگایە، نازیسمەکان لە«دانت زیگ - Danzig» جۆرێک کورەی کارەباییان ساز کردبوو، کە تایبەتی سازکردنی سابوون، لە چەورایی جەستەی مرۆڤ بوو.

«یاکوس کامپانیل لیس» کۆمەڵێک شیعری خۆی کە

زادەی بیرەوەری‌یەکانی رۆژانی تاڵی زینـدانـی بـوونی لە کوشتارگای فاشیستەکانەبە ناوەکانی «ئاندونیس و غەزەلی غەزەلەکان» نووسی کە لەسەر یەک بەناوی «ماوت هاوزێن» ناویان دەرکرد.

بەشی «ئاندۆنیس» بەم جۆرەیکە لە ناوی را دیـارە، لە زمـان پـیاوێکی دیـلەوە دەگـێردرێتەوە کـە مـەرگی هاوزنجیرانی خۆی دیتووە. «ساندۆنیس» ئەبینێ کە چۆن هـاورێکانی لە کـاتی بـێگاری کـێشان و هـەڵ گـرتنی گاشەبەردەکانی قورس، لەتاوماندوێەتی و خوێن لەبەرلەش چـوون دانـەدانـەیان گـیان ئـەدەن. بـەڵام بـەشێکی تـری «غەزەلی غەزەلەکان» شیعرێکی ئەویندارانەیە.

شـاعیری دووەم «یـانیس ریـتسوس»ە، ئـەم شـاعیرە خاوەنی کۆمەڵێک کورتە شیعرە بەناوی: «گۆرانـی‌یەکـانی نیشتیمانی رەنج». لەم شیعرانەدا نمونەی بەرزی مۆسیقاو شیعری بەرخۆدان بەدی ئەکرێ. ئەم شیعرانە، زۆربەیان لە مەر ساڵەکانی رەشـی زاڵ بـوونی سـەرهەنگەکـان بـەسەر وڵاتی یۆنان نووسراون.

یـــانیس ریـــتسوس Yanis Ritsos بـــەناوبانگترین شاعیری هاوچەرخی یۆنان دەربارەی ئەم زنجیرە شیعرە وتارێکی بەم جۆرە نووسیوە.

«تەواوی ئەم هـۆنراوانـە ،بـێجگە لە شـانزدەهەمین و حەڤدەهەمین هۆنراوە، لەیەک رۆژدا واتا ١٦ سـێپتامبری ١٩٦٨ لە ئوردوگای زیندانی‌یەکـانی رامـیاری (پـارتێنی Partheni) لە دوورگـەی «لێـرۆس Leros» نـووسراون، هاورێم میکس تێئۆدۆر واکیس» (گۆرانی بێژی هونەرمەند) بە دزی هەواڵی بۆ ناردم کە ئەیهەوێ شیعرەکانم بخاتە سەر شێوەی مۆسیقا. منیش ئەم شیعرانەم بـۆ نـووسی‌یەوە. لە پاشان (رۆژی ٢٩ی نـۆوامبری ١٩٦٩ لە بـەندیخانەی کـارلۆس Karlovassi لە دوورگـەی سـامۆس Samos، جارێکی تر بە شیعرەکانم دا هاتمەوەو بژارم کردن...) ئەم شیعرانە لەبەر ئاشکرا بوونی واتاو بە هۆی دڵە راوکێی خۆم سەبارەت بە سادەبوون و دڵ تەزێنی و ئازار داربوونیان، لە بـــاتی بـــڵاوبوونەوە دەبـــوو بـــە شـــێوەی ئـــاهەنگ خوێندرابانەوە... شازدەهەمین و حەڤدەهەمین شیعری ئەم زنجیرەی هەڵبەستەم لە یەکەمین رۆژەکانی مانگی ١٩٧٠ لە بەندیخانەی کارلۆس نووسی و بـەم شیعرانـەوە زیـاد بوون.

وەرگێری ئەم شیعرانە و نووسەری ئـەم نـووسراوانـە مـەبەستێکی زۆر گـرینگی بـە مـێشک دانـایە کـە وتـنی پێویـست بێت، جـیا لەوەی کـە هـیچ کـەس ئـەتوانێت بـۆ دەمێکیش نابێ تووشی ئەم بیرو باوەڕە پووچەڵە بێ کە بە تێک شکانی فاشیستەکـانی ئـاڵمانی، ئـیتر فـاشیستێک لە جـــیهاندا نـــەماوە، یـــان بـــە تـــێکروخانی ریـــژێمی سەرهەنگەکانی یۆنانی سەرهەنگەکانی تەواوی وڵاتان بەم ئاکام و بەرهەمە مێژوویی‌یە گەیشتون کە بەکەڵک وەرگرتن لەسەر نەیزەو گوللە ناتوانن بەسەر خەڵکدا زاڵ بن. چونکە فاشیستەکان هـەرگیز بـۆ بـیرکردنەوە لە مـێشکیان کـەڵک وەرناگرن، هەر بەو هۆیەش هیچ فـێر نـابن. هـەرگیز ئـەم مەبەستەتان لە بیر نەچێت.

## سەرچاوەکان:

١ـ بەرتوکی: «مردن پیشەو کاری منە» نووسراوی «رۆبێل مێرێل».

٢ـ بەرتوکی: «همچون کوچەای بی انتها» (ترجمە شعر بهترین شاعران جهان) مترجم احمد شاملو.



چەند شیعر لە زنجیرە شیعری

## گۆرانی‌یەکانی نیشتیمانی رەنج

### «یادی مردووەکان»

لە گۆشەیەکی تەلار
باوە پیرە راوەستاوە
لە گۆشەیەکی ترا
دە نەوە
لەسەر مێز
نۆ شەم لەسەر، لەتێک نانی رەق و تەقا
داگیرساون
دایکانی جگەرسوتاو ـ بە گریانەوە
قژی خۆیان ئەرنەوەو
سینگیان ئەکوتن
ناڵەکان کپ و ماتن

هەستی پاکی ئازادی
لەپشتەوەی پەنجەرەوە
روانگەی زووری هەژارانەو
بەداخەوە
ئاخی سەردی هەڵئەکێشێ

## کۆمەڵ

کۆمەڵێکی ژێر دەست
بێ شمشێر و بێ تفەنگ
بە مستی گرێ دراوی
شۆرش ئەگێرن
بۆ وەدەس هێنانی نانی گەل
بۆ وەدەس هێنانی تیشکی خۆرەتاو
سروودی شیرینی ژیان
لەنێو ئاگردانی کوژاوەی تازە بوژاوەی دەروونا
ئەیشارنەوە
پشکۆی دروشمی خۆشی و ناخۆشی‌یان
چونکە ناکاو
ئەگەر بێت و دەنگ هەڵبرن
چیاو کوێستان ئەلەرزێنن

## تەنیا ئەمانە بەس نین

پاک و بێ خۆ رازاندنەوە
کەمتر ئەدواو
بە پاکی سروشتی پێک هاتووی هەڵ ئەگوت
بەڵام لە گەڵکو شمشێر
لەسەر سەری بەرزبوویەوە
وەکو شێرێک نەعرەی لێ داو
بەرەو چیاکان چویەوە
ئێستا تا لە راستی ئەدوێ
تەنیا دروشم و هاواری پێ بەس نیە
تەنیا هەرەشەو جنێوی پێ بەس نیە
بۆ وەدەس هێنانی مافی
ئێستا
تفەنگی پێویستە

## بۆ یۆنانی بوون شیوەن مەگێرە

بۆ یۆنانی‌یەکان فرمێسک مەرێژە
ئەو کاتەی کەوا لەناو خەیاڵا ئەیاندۆزیەوە
بۆ یۆنانی بوون فرمێسک مەرێژە
ئەو کاتەی کەوا، خۆی گرێ ئەدا
قامچی لە مل و چەقۆ لە ئێسکا
بۆ یۆنانی شیوەن مەگێرە
بروانە کەوا: ئەو شۆرشگێرەی لە خوێن گەوزاوە
سینە خێز ئەرواو بەرز ئەبێتەوە
بروانە کە چۆن بەرز ئەبێتەوە
غیرەت ئاگرەو
لە خوێنی رەگی ئاورگی دڵی، هەڵ ئەقوڵێتەوە
پڕ بە گەرووی خۆی
دەنگی هەڵ ئەبڕێ «ئازادیم ئەوێ»
بە تەوژمەوە، هێرش ئەکاتو
سنور ئەشکێنێ
بە چەکی دەستی گڕ ئەبارێنێ
ئەوسا تاریکی
سینگ و چاوو گوێی...
کون کون ئەبێت و
خۆرەتاو هەڵ دێ

چەند شیعر لە زنجیرە شیعرەکانی «ماوت هاوزێن»
شاعیر: یاکووس کامپانێل لیس

## غەزەلی غەزەلەکان

چەن جوانە دڵدارەکەم
بە جل و بەرگی رەنگاو رەنگی رۆژانەی
بەشانەی سەوزی ناو پرچی
هیچ کەس نەبوو تا بزانێ، دڵدارەکەی دڵۆڤانم وەها جوانە
ئەی کیژەکانی ئاوش ویتس
ئەی کیژەکانی داخاو
ئێوە دڵدارە شۆخەکەی منی کۆیلەتان نەدیوە؟
لە ئۆغرێکی درێژخایەنا توشی بووین
جل و بەرگی بەری شڕو وڕ بوو
قژ ئاڵۆز و ... شانەی ناو پرچی نەمابوو
چەن جوانە دڵدارەکەم
کە چرای ژوری دایکی بوو
براکەی...
بە رادەیەک خۆشی ئەویست
کە رۆژ و شەو... روومەتی سووری ماچ ئەکرد
هیچ کەس نەبوو تا بزانێ دڵدارەکەی دڵۆڤانم وەها جوانە
ئەی کیژەکانی ماوت هاوزێن
ئەی کیژەکانی بێلزێن
ئێوە دڵدارە شۆخەکەی منی کۆیلەتان نەدیوە؟
لە گۆرەپانێکی ساردی سەهۆڵ بەستو
کە ترس و مەرگی لێ ئەزا
توشی خۆشەویستی تۆ بووین
وەکو بەفری سپی وابوو
لە پێستی ناسکی بازووی
ژمارەیەکیان چەسپاند بوو
ئەستێرەیەکی زەردیش
لەسەر دڵی ئەدرەوشاوە



# وەرزەکانی با

**• ورمێ - خالید ڕەسوولپور**

چل ساڵ بەر لە ئێستا، لەسەرەتای وەرزی بادا، چاوەکانت بەم جیهانە هەڵێنا. چوارەمین کچی دایکت بووی و هەشتەمین منداڵی باوکت. لانکەکەت سەوز بوو. بەر لە تۆ کچێکی تێدا گەورە ببوو و دوو کچی تێدا مردبوون. با، دەنگی پیاوەکانی دەهێنا ناو لانکەکەت کە لەسەر بانەکان خەریکی سواخ کێشان بوون.

ئەوانەت لە بیر نەماون، دایکت خۆشی نەدەویستی. ناویان نای بەسێ. باوکت زۆر تامەزرۆی کوڕێکی دی بوو. کوڕێک لە ژنی یەکەمی. دەیگوت دوو کوڕم بەسە. بەڵام تاقە کوڕەکەی ژنی دووهەمیشی، جەلال، بیست و هەشت ساڵ پاش لە دایک بوونی تۆ، مرد، لە سی و پێنج ساڵی دا. گوتیان بە دەردی مفاجا

چوو، لە دووهەمین وەرزی بای ژینت دا هەڵستایە سەر پێ. زەوی بە قەدەر نیوگەز لە چاوەکانت دوور بۆوە. لە دەسرازە[1] و لانک دەربازت بوو، لە پشتی دایکت هەڵکەندرای و کەوتیە سەر گەڵا وەریوەکانی خوار گردی سەوجە[2]. پرچەکانت ڕەش بوون، چاوەکانت ڕەش بوون، سەرمات بوو، بەڵام هەر جار

تاجارێ کە پشیلەیەکی نادیار دەی‌میاواند، سەرماو لانک و پشتی دایکت لە بیر دەبردەوە. سێهەمین وەرزی بای ژینت لە یاد نەماوەو لە چوارەمین وەرزی بای ژینت، تەنیا کچێکی کراس زەردی پرچ درێژت لە بیرە کە لە ژێر دارە تەلەمەیەکی درێژ دانیشتووەو بەسەر سورمانەوە دەڕوانێتە بلندترین چلەکانی کە بە دەستی باوە، ئاسمان گەسک دەدەن و دەم و چاوی رۆژ دادەماڵن. پێنجەمین وەرزی بای ژینت لێواو لێوە لەتاوی بەسێ. هەر کەسێ زاری هەبوو بانگی دەکردی. بە شەوان، یەک لە کۆلانەوە تاوی بەسێی دەقیژاند و دایکت دەیگوت «شەو لەبانە»[٣]. لە شەشەمین وەرزی بای ژینت دا تورەکەیەک قاشوولەت[٤] کۆ کردبۆوە، فیرەبازەڵێن[٥] ببووی. پێنج دەستە خوشکت[٦] هەبوو. تەنیا ناوی سێ‌یانت لە بیرما: ئەستێ، فاتم و ماپەرە. لە دووەکەی دی یەکیان مردو ئەوەی دی ماڵیان رۆیشتە شارویران[٧].حەوتەمین وەرزی بای ژینت بە بەفر شاردراوەتەوە. بەفر سێ هێندەی باڵای تۆ بوو. هەموو شەوان باوکت و جەلال لەسەر بان خەریکی بەفرماڵین بوون. سەربانەکان دڵۆپەیان دەکرد قاپە شینەکەی سەرکورسیەکە زووتر لە ئەوانی دی پڕ دەبوو، تورراو بوو، ئاردو کەم ببۆوە. ئاردتان نەمابوو. چونە ماڵی کاک سێمان، ئەوانیش نەیانبوو، ئاغا دووتای[٨] بە قەرز دانێ. هەشتەمین وەرزی بای ژینت بە رەنگی پرچەکانی دایکە خەجیجت بوو. ژنی دووهەمی باوکت، لێت مۆڕ دەبۆوەو قسەی بە دایکت دەگوت، رقی لێت دەبۆوە. پاش بەسەرداهاتنی چوار ساڵان، لە دوازدەهەمین وەرزی بای ژینت، لە هۆی دژایەتیەکەی گەیشتی، باوکت لە هەموو کچەکانی خۆشتر دەویستی و بە دایکەکاتی گوتبوو بۆ خۆمی بە ژن دەدەم. بیست‌و شەش ساڵ دواتر، لە سی و هەشتەمین وەرزی بای ژینت دا، دایکە خەجیج، نیو ساعەت پێش مردن، گەردنی خۆی پێ ئازادکردی. لە نۆهەمین وەرزی بای ژینت دا دەیان ناردیە کاری ماڵی ئاغا. ئاغاژن خۆشی‌دەویستی، دەیگوت دەست پیس نیە. با، دەرگا گەورەکەی ماڵی ئاغای پێک‌دادەدا. جووتە سەگەکەی بەر دەرگاکە، دەیانوەڕاند، ئاغاژن کۆنەکراسێکی پێ بەخشی، هی خاتونی کچی بوو، کراسەکە گوڵی زەردی وردی تیابوو. بۆ باڵات کورت بوو، تا هەشت ساڵان راتگرت. لە ژێر بوخچەکەت نابوو، هەرگیز لە بەرت نەکرد لە حەڤدەهەمین وەرزی بای ژینت دا، کاتێ هێوەرت بە دواتا هات‌و ناچار لەگەڵیا گەڕایەوە ماڵ، لە بوخچەکەت دانەمابوو، کێ بردی؟ کێ دزی؟ نەتزانی. لە سی و شەشەمین وەرزی بای ژینت دا، لەسەر کاغەز بۆت نووسیم: حەڵاڵی بێ! لە یەکێک لە شەوانی دەهەمین وەرزی بای ژینت دا سێ عارەبە هاتنە ناو سەوجە، ماڵ و خێزانی کاک زورار بوون، هەر ئەودەم کوێخا عەیز ناوی لێنا: زوراری شەوێ! ئەو ناوە بوو بە نازناو و ناسناوی پشتاو پشتیان.

زوراری شەوێ چوار کوڕی هەبوو. کوڕی بچووکی ناوی رەحمان بوو. دوو برای رەحمان ژنیان هێنا بوو و ئەوی تریان، ساڵێک دواتر، سێ رۆژ بەر لە زەماوەندی، لە بیست‌و حەوت ساڵیدا مرد. رەحمان کورتە باڵا بوو، دەنگێکی خۆشی هەبوو و گۆرانی دەگوت. دوو ساڵی دی مابوو زوراری شەوێ ببێ بە خەزورت. لە یازدەهەمین وەرزی بای ژینت دا دەستت لە دەستی حەوت کچ و دوو کوڕی هاوتەمەنت دابوو و بە دەنگی بلند دەتان خوێند:

ئەمن و تۆ هاواڵین
لەسەر پەین‌و پالانین
وەک جووتەی دەسماڵانین.

قالە[٩] شێتی کوڕی سۆفی رەسوو، سەری دارێکی بە ریخ کردبو و رەپێی نان. نەتتوانی بۆی دەرچی. قالە گەیشتە سەرت، گریای و هاوارت کرد، با هەڵیکردە ناو کۆڵانەکەو تەپ و تۆز تۆو قالەی لە خۆدا ون کرد. قالە دەستی بە چاوەکانی گرتبوو و دەگریا. گرمە گرمی هەوران پەیدا بوو، هەستایەوەو کراسەکەت لە ژێر پێی قالە دەرهێنا، کراسەکەت سوور و زەرد بوو، دوازدەهەمین وەرزی بای ژینت درەمێک[١٠]، ترێ بوو کە دایکە خەجیج دایە دەستت تاکو بیبەیە سەر زەوی بیدەیە دەستی رەحمان کوڕی زوراری شەوێ کە بە هەرەوەز هاتبووە یاریدەتان. نەتدەزانی هۆی چیە، بەڵام هەستت دەکرد دەبێ لێی بترسی، رەحمان پێکەنی و ترێکەی لێ وەرگرتی، ویستی لەگەڵت بدوێ، گەڕایەوە و راتکرد، خارت دا ناو دێ، سەگەکانی بەردەرگای ئاغا دەیانحەپاند، نەت‌وێرا بە بەردەمیاندا تێپەڕی. دایکە خەجیج چاوەڕێت بوو، ماچی کردی، هاژەی بات هەرگیز لە یاد نەبردەوە، دوو سێ ماڵ ئەولاتر قوڕیان دەکێشا سەربانی. دەنگی چەند پیاوان دەهات، دەنگی مام قۆدیلەت ناسیوە، دەیگوت خێرابن، هەر ئێستایە باران دایدێ. دڵە کوتەت بوو و پێت خۆش بوو، ئەوەندە باران بباری، هەموو دنیا بە سێڵاو دا بچێ. لە سیزدەهەمین وەرزی بای ژینت دا یەکەم منداڵت چاوی بە مەتبەقی[١١] ماڵی کاک زورار هەڵێنا. کوڕ بوو، کاک زورار ناوی نا مەحمود، بەناوی باوکی کرد، حەڤدە ساڵ دواتر، دە ساڵ بەر لەوەی من بەجێ بهێڵێ و لە باوەش گۆڕستانەکەی شێخ سمایل[١٢] دا بخەوێ، مەحمودت جوانەمەرگ بوو، کەوتە ژێر مینی بوسەکەی شنۆ - نەغەدە. لە چواردەهەمین وەرزی بای ژینت دا رەحمان قاشولەکانی لێ فڕێ دای، گریای، بۆ یەکەم جار داری رەحمانت وەپشت کەوت. بە درێژایی ساڵە باڵندراوەکانی داهاتوودا، دەیان جار کەوتیە ژێر شەپی رەحمان. لە پازدەهەمین وەرزی بای ژینت، دوو کچت بە زگێک بوو، بە مردوویی. لە شازدەهەمین وەرزی بای ژینت دا کچێک و کوڕێکت بە زگێک بوو، کوڕەکە سێ رۆژ ژیا. کچەکە زیندووما. جەلیلی هێوەرت ناوی نا فاتم. بەناوی دایکیان کرد کە دەیانگوت لە گۆڕستانەکەی سێ کانیان[١٣] خەوتووە. لە حەڤدەهەمین وەرزی بای ژینت دا مام زورارحەقلی تێک چوو. ئاسمان و زەوی دەدایە بەر جنێو، ئاغای توورە کرد، دەرکران، عوسمانی هێوەرت لە جاشێران[١٤]، دڵخۆشی خواست[١٥]. لە بەیانی‌یەکی ساردو تۆزاوی وا سەوجەتان بەجێ هێشت. سێ گاجوت و پێنج مانگاو گوێ درێژێک و سێ عارەبەتان ناوماڵ هەبوو، هەرگیز ئەو کۆچەت لە بیر نەکرد. مەحمود لە باوەشی باپیرەی دا لەسەر عارەبەکەی پێشێ بوو. عوسمان و جەلیل لە سەر عارەبەی دووهەم، ئێوە سێ ژن و پێنج منداڵ لەسەر عارەبەی سێهەم. رەحمان و کوڕی هێوەرت بە پێ‌یان دەهاتن و ولاغەکانیان لێ دەخوڕی. رەحمان سەری هاویشتبووە خوار و بە قەراغ رێ‌یەکەدا دەهات. گردی سەوجە لەبەر چاوتان ون ببوو. لە هەژدەهەمین وەرزی بای ژینت دا لە قەلاغ[١٦] چاکردن و دەوە[١٧] لێدان یەکەژنی جاشێران بووی. رەحمان وازی لە گۆرانی گوتن هێنابوو. شکابۆوە. سێ پارچە زەوی لە بەر دەستتان دابوو. لە نۆزدەهەمین وەرزی بای ژینت دا کوڕێکت بوو، ناویان نا: محیەدین، بەناوی مامی جوانەمەرگی کرا کە هەشت ساڵ پێشتر مردبوو. نە خۆش و لاواز بوو، مەلا سەیید نوشتەی بۆ نووسی، چاتر بۆوەو وەگاڵە گاڵ کەوت، بەڵام تەنیا چوار ساڵ ژیا. بیستەمین وەرزی بای ژینت داهات. مەحمودیان ناردە بەر گاڕانی ئاغا. مام زورار مرد. ساڵێک پێشتر عوسمان لێتان جیا ببۆوە. ئەوێ ساڵێ تینوایەتی زەوی نەشکا. دەغڵ و دان نەبۆیە، لەوەڕ[١٨]، هەڵێنەدا، زەوی تینو بوو، منداڵەکان برسی بوون، ئاغا توورە بوو. لە بیست‌و یەکەمین وەرزی بای ژینت دا بۆ یەکەم جار

هەستت بە ژانێک کرد لەسەر دلت، گوێت نەدایە. نۆزدە ساڵ دواتر هەر بەو دەردە رۆیشتی و منت جێهێشت. رەحمان لە دەست هەژاری و زەبر و زۆری جەلیلی برای ئۆقرەی لێ هەڵگیرا بوو. دەستی بۆ هیچ کارێ نەدەچوو، لە بیست و دووهەمین وەرزی بای ژینت دا هەموو ژیانی تۆو رەحمان و سێ منداڵت کۆکرایەوە سەر یەک، بوو بە نیو عارەبەیەک و جاشێراتتان جێهێشت و کۆچتان کرد بۆ شنۆ. هۆدەیەکی بێوەژنێکتان بە کرێ گرت و رەحمان دەستی کرد بە کرێکاری. لە بیست و سێهەمین وەرزی بای ژینت دا ئەو زەوییانەی رەعیەتەکان لەسەریان کاریان دەکرد فرۆشترا بە خۆیان. بە قەرزی پازدە ساڵان، بەشی ئێوەش درا بە جەلیل. هەر لەو ساڵەدا محیەدین مرد. لە بیست و چوارەمین وەرزی بای ژینت دا جل و بەرگت بۆ جیرانەکان دەشوشت، نانت دەکرد بۆیان. رەحمان دەستی کرد بە جغارەفرۆشتن. لە بیست و پێنجەمین وەرزی بای ژینت دا دوو کوڕت بە زگێک بوو. یەکیان مانگێک ژیا، بەناوی باپیری زورار کرابوو، ئەوی تریان بەناوی باوکی مام زورار کرا مستەفا. هەر لە یەکەم رۆژەکانەوە زانیت منداڵێکی ئاسایی نیە، نا، منداڵێکی ئاسایی نەبوو. مستەفا، کەڕ و لاڵ و لە دوو لاقەوە ئیفلیج بوو. ئەم کوڕە کەڕو لاڵ و ئیفلیجە، من بووم! لە بیست و شەشەمین وەرزی بای ژینت‌دا کوڕێکی ترت بوو، بەناوی برای مام زورار، عەوڵای ناونرا، عەوڵا سێ مانگ ژیا. لە بیست و هەوتەمین وەرزی بای ژینت دا هۆدەکەی پور مەنیجتان جێهێشت و خانوویەکی دەربەستتان بە کرێ گرت. منت هەمیشە لەسەر کۆڵ بوو. جیهانی من تەنیا تۆ بووی و بێ دەنگی. لە بیست و هەشتەمین وەرزی بای ژینت دا جەلالی برات مرد. منت لەناو چەند ژنان دانابوو و لە حەوشی ماڵی باپیرەی دا لە خۆت دەدا. لە بیست و نۆهەمین وەرزی بای ژینت دا کچێکی ترت بوو، ئەویش هەر وەکو ئەوانی دی نەگەیشتە مانگێک و مرد. لە سی یەمین وەرزی بای ژینت دا مەحمودیش جێی هێشتی، کەوتە ژێر مینی بوسەکەی شنۆ - نەغەدە. حەقدە ساڵی بوو، تەنیا سێزدە ساڵ لە تۆ بچوکتر بوو. پێنج ساڵ دەبوو لە قاوەخانەکەی وەستا سەلیم کاری دەکرد. لە سی و یەکەمین وەرزی بای ژینت دا، من پێنج ساڵانە بووم، ئیدی دەمزانی کەڕو لاڵم، دەمزانی ئیفلیجم، نە لە کەس دەگەیشتم و نە کەسم لێ تێ دەگەیشت. ئەم نۆ ساڵەی باقی ژیانت، سات بە سات لە خوێن و پێستم دایە. ساڵەکان دەهات و دەچوون، لە نۆ منداڵان دووت بۆ مابۆوە، ئیتر منداڵت نەبوو. فاتم مێردی کرد و بردیانە کوورەخانە. خانوویەکیان کڕی. دوو هۆدەو و پێشخانەیەک و مدبەقێکی هەبوو. دەمتوانی بەشەقە[19] بڕۆم، بەڵام زۆر بە دەگمەن زاتم دەکرد لە ماڵ وەدەرکەوم. هەمیشە لە لام بووی، هەمیشە لە لات بووم، پیر ببووی، پرچەکانت سپی ببوون. تەنیا منت بۆ مابۆوە، بە دزی من، هەمیشە دەگریای و من لە ناو دنیای لە بن رانەهاتووی بێ‌دەنگی و بێ‌زمانی و بێ‌دەرەتانیم دا هەر تۆم هەبوو، بە هەموو هزر و بیرمەوە هەستم بە چارەرەشی تۆ دەکرد. شەوان، بە بێ بۆنی لیزگەی مێخەکی سەر ملت خەوم لێ نەدەکەوت. شەوو رۆژ چاوم لە دەرگای ژوورەکەم بوو کەنگێ دێیە ژوورو کەنگێ دەڕۆیە دەر. باوکم لە چوار رێیان بۆتکەیەکی[20] دانابوو و توتن و جغارەی دەفرۆشت. ئەوینی نێوان من و تۆ رۆژ بە رۆژ قوولتر دەبوو. هەرگیز لە یادم ناچێتەوە، ئەورۆژە پیرۆزەی پێنج ساڵ پێش، کاتێک دەرگای حەوشەکە کرایەوە و تۆ بە پەلە هاتیە ژوور. هەموو لەشت پێدەکەنی، هاتی، دەباوەشت گرتم. لە خۆشیان دەگریای، لێت تێ نەگەیشتم. شەو کە باوکم هاتەوە ماڵ، تاکو نیوە شەو قسەتان کرد. باوکم دڕدۆنگ مابوو. من خەوم لێکەوت، بۆ ئێوارەی سبەینێ دوو کتێبت هێناوە ماڵ و لەو رۆژە را، ئیتر خەمەکان لە دڵمان دەرکران. هەموو ئێواران بۆ ماوەی دوو ساعەت دەچوویە کلاسی دەرسی سپای دانیش[21] کە سێ چوار ماڵ لەولا تری ماڵی خۆمان بوو. کاتێک دەهاتیەوە، بە پەلە، ئەوەی پێیان گوتبووی بە منت دەگوت. تۆ سی و پێنج ساڵت هەبوو و من دە ساڵ. دەتەویست رێگایەک بدۆزیەوە بۆ ناو جیهانی بێ دەنگیم. پێ‌نووس لەناو قامکەکانتدا دەلەرزی. پرچەکانت شۆڕ دەبوونەوە سەر دەفتەرەکە، لەناو دڵی مندا شایی بوو. یەکەم جار بوو هەستم بە شادی و خۆشی تۆ دەکرد. پاش ساڵێک، ئیتر دەمانتوانی بە نووسین لە یەکتر بگەین، باوکیشم بە شادی تۆوە شاد بوو. جار جار دەیەویست وەکو ئێمە شتێک بنووسێ، بەڵام نەیدەتوانی، پیر ببوو. کوور ببوو. حەفتا ساڵەی دەنواند، بەڵام پەنجاو پێنج ساڵە بوو. سێ ساڵ بەر لە ئێستا، لە سی و حەوتەمین وەرزی بای ژینت دا بە جوانی دەماننووسی و دەمان خوێندەوە. قسەکانمان بە یەکتر دەگوت. بیرەوەرییەکانت بۆ من دەگێڕاوە. تاکە تاکەی ساڵەکانی ژینت بۆ نووسیم. باسی بات بۆ نووسیم. ئەو بایەی ژیانی رەپێچەک دابووی. ئەو بایەی رابردووەکانی بردبووی. ئەو بایەی شەو و رۆژ بەسەر ساتەکانتدا هاژاندبووی، لووراندبووی، قوولاندبووی، بە یەکەوە دەگریاین، بە یەکەوە پێدەکەنین، بە یەکەوە رۆژانی ژیانمان دابەش دەکرد و لە کۆتایی هەموو شەوەکانمان دا تۆ بە تەنیا زمانێک کە فێر ببوی بۆت دەنووسیم: «مستەفا تۆم خۆش‌دەوێ» و منیش بە تەنیا زمانێک کە فێر ببوم، دەمنوسی: «دایەگیان تۆم خۆش‌دەوێ». کتێبخانەیەکمان هەبوو. کتێبت بۆ دەکڕیم و من شەو و رۆژ دەمخوێندەوە و تۆ لە خۆشیان چاوت لێ هەڵنەدەگرتم. کوڵمەکانت سوور بوونەوە. توند و تۆڵتر ببووی. ژانی دڵت لە بیر کردبوو، بەڵام... دڵت تۆی لە بیر نەکردبوو دایەگیان!

لە چلەمین وەرزی بای ژینت دا، حەوت رۆژ بەر لە ئێستا، بە خاکیان ئەسپاردی، بۆت نەگریام، بۆت ناگریم، باوکم، پاش کۆچەکەی تۆ نەچوتە سەر بۆتکەکەی و ئێستا لە ژوورەکەی دی دا، خۆی لە خەوداوە. دەزانم نەخەوتووە. هەر دوومان - من لەم ژورە، ئەو لە ژوورەکەی دی - سەرمان سوڕماوە. لە یادمان نەماوە چۆن بگریێن، دەزانم ئێستا لە گۆڕستانەکەی شێخ سمایل، بادێ. ئەو گوێی فوت کردووە و من چاوم زەق بریوەتە پەنجەرەکە، چەند ساتی دی بایەکەی سەر شێخ سمایل دەگاتە حەوشەکەمان، هات... هات...حەوشەکەمان تاریک بوو، ژوورەکە وەلەرزین کەوت. هات... با هات... گەیشتە سەرمان. بابێ... بە خێر بێ... بابێ!

فەرهەنگۆک:

١- ئەمسرازە: دەست‌رازە، منداڵی لە ناو لانک دا پێ دەبەستن.
٢- سەوجە: گوندێکی قەراغ شنۆ.
٣- شەولەبانە: وشەیەکە منداڵی پێ دەترسێنن (بە واتەی: شەو لە سەربانە).
٤- قاشوولە: وردە شوشەو چینی منداڵ کایەی پێ دەکەن.
٥- بازەڵێن: پێنج بەردێن، کایەیەکی کچانە.
٦- دەستەخوشک: هاواڵی کچ بۆ کچ.
٧- شاروێران: مەڵبەندێکی سەر بە مەهاباد.
٨- تا: تەلیس، قەردە.
٩- قالە: بچووک کراوەی قادر.
١٠- درەم: نیو کیلۆ.
١١- مدبەق: مەدیەق، شوێنی نان کردن (مطبخ).
١٢- گۆڕستانی شێخ سمایل: گۆڕستانێکی قەراغ شنۆ.
١٣- سێ کانیان: گوندێکی مەڵبەندی دەشتەبێل سەر بە شنۆ.
١٤- دڵخۆشی خواستن: ئیزن وەرگرتن و پێک‌هاتن رەعیەت لەگەڵ ئاغا.
١٥- جاشێران: گوندێکی سەر بە شنۆ.
١٦- قەولاغ: قەڵاخدان، جێی تەپاڵە و ئاوردوو.
١٧- دەوە: سەوتەمەنی چێکراو لە تەپاڵە.
١٨- لەوەڕ: گیای خواردنی ئاژەڵ.
١٩- شەقە: داری بن هەنگڵ.
٢٠- بۆتکە: دوکانی چێکراو لە تەنەکە(دکە).
٢١- سپای دانیش: رێکخراوێکی وەکو (نهضت سوادآموزی) بەر لە شۆڕشی ئیسلامی.

• هۆڵەند - سەلاح شاکەلی



# ناڵەی نەی لای چەند شاعیرێک



بەهرەی شیعر نووسین لای عارفان و خوداناسان سنووری خەیاڵ دەشکێنێ و خۆشەویستی یەزدانی مەزن بە جۆرێک رەنگی داوەتەوە لە شیعرو قسەی ئەواندا کە کەسێکی هاودەردو حاڵزانی ئەوان نەبێت پەی بە واتای شیعرو قسەی شەکەر رێزی ئەوان نابات و تێگەیشتنیان بۆ کەسێکی ساکار کارێکی لەبارو سانا نیە، عەشقی خودایی و مەستی بادەی ئەو خۆشەویستیە لەوێنەگەلێکی سەیردا خۆی نواندووە کە لەو سروشتە بەرینەیان وەرگرتووە. هەر لە جوانی ئازیزو سیحری جوانیی دارو درەخت وجۆگەلەو کانیاوو باڵندەی دەنگ خۆشەوە بیگرە تاکو مانگەشەوو ئاسمان و شەوی خامۆش و دووری ئازیزو ناڵەی نەی و شاخی بەرزو دۆڵی پڕو چڕو... هتد، بەڵام زۆر جاریش بەوانە ئاگری دەروونیان دانەمرکاوەتەوەو پەنایان بردۆتە لای جام و مەی و مەیخانەی بادەی ئەو عیشقە خوداییە کە هەر یەکێک لەوان بە جۆرێک و لە چاوێکەوە تەماشای کردووەو مەبەستەکەی بە جۆرێک دەربڕیوە کە سەرجەم بیرو هۆشی ئەوان لە مەبەستیاندا بەندەیی مرۆڤ و مەزنایەتی خودای گەورە پیشان دەدات.

لێرەدا نمونەی شیعری چەند شاعیرێکمان هێناوەتەوە کە ناڵەی نەی چۆن کاری تێ

کردوون و چیان لەبارەیەوە وتووە:
مەولانای رۆمی لەسەرەتای «مثنوی» دا دەڵێ:

بشنو از نی چون حکایت میکند
وز جدائیها شکایت میکند
سینه خواهم شرحه شرحه از فراق
تا بگویم شرح درد اشتیاق
من بهر جمعیتی نالان شدم
جفت بد حالان و خوشحالان شدم

واتــە گــوێ بگــرە لە نــەی کــە چــۆن ســــەرگوزەشتەی خــۆی دەگــێڕێتەوە کــە بــێ‌دادیــەتی بــە دەست دەردی دووری لە ئازیزان و جیابوونەوە لەوان و دەڵێ: لەو کاتەوە کە لە نەیزار دابڕاوم، هەموو خەڵک بە ژن و پیاوەوە لەگەڵ نـاڵەی مـندا دەگـرین، مـن بـۆ نیشانەی کۆششە بۆ دەروون پاکـژ کـردنەوە لە هــــەموو، خــەوشێک و هــەموو بــاوەڕێکی ناشیرین و ناپەسەند بە رادەیەک تا وای لێ دێ شایستەی ئەوە بێت کـە نـووری خـودای بـۆ دابەزێت.

مەولەوی تاوەگۆزی گڕی عیشقی خودایی بەرۆکی گرتووە بۆیە دەم بـە هـاوارو زاریـەوە هانای دڵی بۆ لای ساقی و (مغنی) و نەیچی و ئاهەنگی موترب «گۆرانی‌بێژ» دەبات و دەڵێ:

ساقی مەی هەی داد مغنی چەنگێ
نەی چی هەی فەریاد مترب ئاهەنگێ

لە شیعرێکی دیکـەی دا مـەولەوی گـڕ و کڵپەی دەروونی زیاتر تاوی سەندووەو دەرەنگ بە دەنگ هاتنی نەیچی شپرزی کردووە و دڵی ئارامی لێ بڕیوە، بۆیە بـە حـەسرەتەوە داوا لە نەیچی دەکات: ئاوازێ لێدە با کار لە گـیان و جەستە بکات و ریشەی دڵیشی پەی بکات:

سادەی ساحب نەی ریشەی دڵ کەرپەی
تا لێم دەرئەی‌فەرد وەنەزمەکەی نەی

ســـەیدی هــەورامــی (١١٩١ـ١٢٦٥ی کۆچی) دەروونی خۆی شوبهاندووە بە کـونی جێ پەنجەی نەی کە لە دووری ئـازیزدا کـون خاوەنی ئەو جوانیەیت چون دەروون کون کون نەبێ و وەک نەی نەناڵێنێ.

نــــالی «مــــەلا خــدری شــارەزووری ١٧٩٦ـ١٨٥٥ز» لە دێــــڕی دووەمــی ئــەم شیعرەی دا دەروونی خۆی وەکو هەوارگەیەکی چۆڵ و هۆڵ تەماشا کردووە کە لە تاو ئـازیزدا وەکو نەی هاوار و ناڵەی لێ هەڵدەستێ، چونکو نەی لەناوەوە بۆ شەو هیچی تیدا نیە. نالی لەو دەروازەوە تەماشای دەروونی خۆی کردووە:

نەمردم من ئەگەر ئەم جارە بێ تۆ
نەچم شەرت بێ هەتا ئەم خوارە بێ تۆ
دەروونم خاڵیە وەک نەی دەناڵێ
هەوارێکی چ پڕ هاوارە بێ تۆ

ئەحمەدی خانی «١٦٥٠ـ١٧٠٦ز»، خانی کاتێ بە بـادەی گـوڵرەنگی سـۆفیان و زانـایان مەست دەبێ خۆی بە نەی دەشـوبهێنێ کـە لە جـیاتی نـاڵەو هـاوار بـو دووری ئـازیز یـان جودایی، خـەمێکی گـەورەتر بـووەتە وێردی سەر زمـانیو بـۆی دەسـووتێ، ئـەویش ژێـر دەســـتی و بـەشکراوی گـەلەکـەیەتی کـە (لە دێڕەکانی پێش ئەم دێڕە شیعرانەی خوارەوەدا هاتووە)، خانی بەو مەستیەوە وەکو خۆی دەڵێ بــە تـەرەننوم دەنـاڵێنێ و تـووتی ئـاسا دێتە تەککەلوم «ئاخاوتن» وەک دەڵێ:

تەشبیهی نەیێ بکەم تەرەننوم
تووتی سیفەت ئەز بکم تەککەلوم
داکەشف بین ژ من کەرامات
مەشهوور بین ژ من مەقامات



کەسێک دەخوێنم کە دەردی دووری مـۆرۆی کردووەو باسی ئازاری دووری ئازیزانـیان بـە گوێدا دەدەم، هەرکەسێک دوور لە خـوێش و دیار ژیا بۆ کـات و سـاتی دیـدار پـەرێشانەو خولیایەتی کەی بگاتەوە ئازیزان و بەوان شـاد بێتەوە، من لە ناو خەڵکدا ئـاشنای بـێ نـەواو خۆش بەختانیشم.

مــــەولەوی «ســــەید عــەبدوررەحیم تــاوەگـۆزی (١٨٠٦-١٨٨٢ز) لەم شـیعرەدا نــاڵەو گـڕی دڵ و دەروونـی بـەسەدای نـەی شوبهاندووەو بە ئاوازی نەی ئەوەی دڵـی تـاو داوە پێی دەناڵێنێ، بەڵام بـەوەش نـەوەسـتاوەو ئامادەیە پیاڵەی زووخاوی جـەرگ بـڕ وەکـو مەی بێنێتە سەرەوەو بینۆشێ بـۆ ئـەوەی دڵـی دابمرکێنێ، بۆیە دەڵێ:

نەوای ناڵەی دڵ وێنەی سەدای نەی
پیاڵەی زووخاو مەنۆشۆ چۆن مەی

هــاوار و فــوغانی عــارفانی خـودانـاس بووە. لە شیعری «دڵ بێروونە» کە تێ هەڵکێشی فارسی و هەورامیە دەڵێ:

دەروونم پێسەو لوولەو نەی چەنیە
ز هجرانت کند پیوستە فریاد
چەمێت سادو بڕۆت نوون و دەمت میم
رخت لوح و دلم طفل و تو استاد
دهی جورم، کشی جانم، بری دل
مەزۆنۆ، خاترم، چێشت کە رۆشاد

واتــە: دەروونــم وەک شـمشاڵی ئـامیش «نەیجە» کون کونەو لە دووری تودا هەی دادو هاواریەتی و دەناڵێنێ، تۆ کە چاوت (صـاد)ە، برۆت (نون)ە، دەمت (میم)ە، یانی «صـەنەم»، بــــوتەکـەم رووەمـــەتت «لەوح»ە، تـەختەی نووسینمە، دلم منداڵە، تویش ئوستادی، تۆکە

تێبینی:
واتای شیعرەکانم بە درێژانەنووسیوەتەوە، تەنها ئەو دێڕانەی وشەی نەی تیایە کە مەبەستی باسەکە بوو.

سەرچاوە:


١ـ د. ئەمین [illegible] گۆڤاری [illegible] ژمارە [illegible]
[illegible] ١٩٩٩ بەغدا
٢ـ دیوانی [illegible]
چاپی [illegible]
٣ـ دیوانی [illegible]
٤ـ [illegible]
[illegible] چاپی بەغدا
٥ـ [illegible] گۆڤاری [illegible] ژمارە ١٢٣، [illegible] ١٩٩٩ بەغدا
٦ـ گۆڤاری [illegible] ژمارە ١٦ [illegible] ١٩٩٣
٧ـ [illegible] ١٩٣٩ـ ١٩٢٢

• سەیید کازم ژارئاوایی

# نەورۆز و هوزانڤانێن کورد



نەورۆز جەژنەکی کەوناره باب و باپیرێت نەتەوێ ئاریائییە. ئەهمییەت و پیتە پێ کرنا ڤێ بیر ئینانا وان دەب و رەسمێت کەونار تێکەلی دگەل کەوناری و مێژین بونا ڤی دا هەیە. هندێ قەدەرا کو رابهوری یا نەتەوەیەکی روناهیتر و شارستانیەتا وی دویرو درێژتر بیت. دەب و رەسم و فەرهەنگا رەسەنە وی بەرفرەتر و پانو بەرینتر دبیت و سپەهی ترو جندیتر تیتە بەرچاڤ. ڤیجا وەزیەتا دەب و رەسم و ئائینێت هەر نەتەوەیەکی بێژەری ڤی راستی بی یە.

راگرتنا مەعنەوییەت و شعارێت کەونارە ڤی ل هێزێت لەشکەری و بەرێک رابەزینێت هەسکەری و سەرکەتن ل شەڕ و پێکدادانا دا بو مکوم راگرتنا پشتیڤانیا فەرهەنگی و درێژی دانا ژیانا نەتەوەیی زیدەتر ئەسەر هەیە. ب قووەتترین هێزێت لەشکرین هێرشکەر ئەگەر شیا بن بۆ ماوەیەکی بەر وەخت و کیم قووەتا بەرەڤانی کەرە ولاتەکی تێک بشکینن ئەما نەشیانە ب ئیکجاری دەب و رەسم و ئائینێن خەلکی پوچ بکەن و لناڤ ببەن نەتەوی کورد ل درێژیا مێژیی دا پر ئەڤراز و نشیڤی بچاڤی خوە دیتیە، ئەما هەمیشە ل فەرهەنگا بەرفرەیە خوە بەهرە وەرگرتیەو ل هەمی دەورو زەمانا دا ب دلو گیان بەرەڤانی لی کریەو بو ئەڤراز برنا وان خەبات و کوشش کریە. یێک ژ دیارترین دەبو رەسمێت کەونارە نەتەوێ ئاریایی کو نهو ل هەریمێت جوربجورە جهانی دا دژین برێڤە برنا دەبو رەسمێت جەشنا نەورۆزی یە. ل نیشان و بەرژەنگ را ڤە دیارە کو نەوروز نیشانیی نەجات بون ل بن دەستی و رزگار بون ل ئیزاو زەحمەتو گەهشتن ب خۆشی و رۆژەکی خوەشتر ل یا پێشدایە ڤیجا ب هاتنا نەورۆزێ ل هندەک نوکتێت جهانی هەوایی دونیایی بەر بگەرمی و خوەشیی دچیت و خەلک ل چەنگی سرو سەقەما دانێ زڤستانێ رزگار دبیتو جهان کەسک و شین دبیت سەرانسەر دبێتە گول و گولزار. تەیرو تووال بکەیف دکەڤیت و دەست بخویندنێ دکەت هەمی زیندەوەرک سەر لنوێ دەست ب خەباتو تێکۆشانێ دکەت. ئەوە مێزگینیا سال نوێ و ژیانەکی نوێ ددەن.

هەر وەکو شێخ سەعدێ رەحمەتی دبێژیت:

آدمی نیست که عاشق نشود وقت بهار
هر گیاهی که به نوروز نجنبد حطب است

هەبونا داستان و ئەفسانێت جوربجورو دلگر ل بارا نەورۆزێ دا دشێن ب دو ئەگەرا بن.

١ـ ئەڤێ جەشنێ هەمی نەتەوێت ئاریایی یا خوە دزانن.

٢ـ هەر یێک ژوان نەتەوا ب بەرچاڤ گرتنا مێژوو فەرهەنگا بهوریە خوە ئەسل و ئەساس و داستانەک بو وی بەرچاڤ گرتنە. مێژو نیشان مە ددەت کو نەتەوێ ئاریایی ل کەنڤە حاوت جەشن هەبونە: ١ـ جەشنا نەورۆزێ. ٢ـ جەشنا مهرەگان. ٣ـ جەشنا سەدە. ۴ـ جەشنا تیرگان. ۵ـ جەشنا فەروەردگان. ۶ـ جەشنا کو سەبرنشین. ٧ـ جەشنا بەهمەن کو ل بەینا عەیدا نەورۆز و عەیدا مهرەگاندایە.

ل پشکا پترە پەرتوکێت مێژویی دا سەرەکانیا جەشنا نەورۆزێ دگەرێتەڤە بو سەردەمی پادشاتیا جەمشیدی پیشدادی و کاوەیی ئاسنکوت.

ل وێ بارێدا گوتن و روایەت یێکجار زۆرن. بەلی ل هەمی زیدەتر دگیرنەڤە بو سەردەمی زولم و زۆرداریا (زوحاکی) ئەژدەهاکی. هەروەکو فردەوسی هوزانڤانێ حەماسەبێژ ل شاهنامێدا دبێژیت:

چنان بد که هر شب دو مرد جوان
چه کهتر چه از تخمهٔ پهلوان
خورشگر ببردی به ایوان شاه
وزو ساختی راه درمان شاه
بکشتی و مغزش برون آختی
بر آن اژدها را خورش ساختی

ل قەدیمڤە چارشەنبیا ئاخرێ سالێ «چهارشنبه سوری» و جەژنا نەورۆزێ و سیزدە بە دەر لناڤ ئیرانیادا باڤ و عادت بویە کو ب دەبو رەسمەک تایبەت تێنە برێوە برن.

نەوروز یانی روژا نوێ، ڤیجا ئەڤروژا نوێ چ نەجات بون ژ دەستێ زولم و زورداریی بیت، چ نەجات بون ژ دەستی سرو سەقەم و نەڕحەتیا دانی زڤستانێ بیت، چ نەجات بون ژ نەڕحەتی و عاجزیا بیت نەجات بون ژ هەر نەخوەشیەکی و گەهشتن ب روژەکی خوەش نەوروزە، روژەکی نوێیە ل ژیانا مروڤ دا.

لێرەدا مە نەڤێت مێژویا نەورۆزێ و دەب و رەسمێن نەورۆزێ بدەینە دیار کرن و یاس بکەین، بەلکی من چەند هوزانێت هوزانڤانا لبارا نەوروزێدا گرتیە بەرچاڤ و دگەل دەسکەکی بنەڤشوک و نێرگز و بەیبونێت بهین خوەش لدەڤ ئاڤ و چیایێت کوردستانی دکەمە دیاری بو هەمی گەلێ ئاریایی بقەیایی و گەلێ ئیرانی و بتایبەت نەتەوێ کورد دگەل جەژن پیروزیەکی گەرمو گوڕ پێشکێش خزمەتا خوالدڤانێن هێژایە گوڤارا ئاوێنە دکەم، هیڤی دارم کو هەمی روژێن ڤە نەورۆز و نەورۆزا گەلی کورد پیروز. دیسان هوزانەک ل فردوسی لبارا مێژویا جەژنا نەوروزێدا کو دبێژت:

به جمشید بر گوهر افشاندند
مر آنروز را نوروز خواندند

سر سال نو هرمزو فرو دین
بر اسود از رنج تن دل ز کین

هوزانڤانێ عارف و دیندارە کورد خودا لێ خۆشبویی مەلا ئەحمەدێ جزیری دبێژیت:

ئەڤ نار سیڤالا دلە
دایم لڤێ قالا دلە
نەوروز و سەر سالا دلە
وەقتی هلیتن ئەو سیراج

لی بەلی ل وی هوزانێ را ڤە تێتە فەهم کرن کو ئامانجا مەلا نە نەورۆزو جەژنا نەورۆزێ، بەلکی ئامانجا وی دیتنا ئەڤینا وی یە کو دبێژیت:

نەورۆز و سەر سالا دلە
وەقتێ هلیتن ئەو سیراج

یانی بو دلێ من وی دەمێ نەوروز و سەر سالە وەختێ هەلێت ئەو هەتاڤ.

مامۆستا هەژارێ رەحمەتی ل شەرحا دیوانا مەلایێ جزیردا سیراج ب دو تشتا مەعنی لی دایە، هەم بە هەتاو - روژ - خور - وە هەم بە - چرا - لی بەلی چونکی ل

هوزانیدا هلیتن هاتیە - روژ - هەتاو راسترە - چونکی چرا ناهلیت ئەگەر هەلبیتن با - چرا راستتر بو.

ئەما هوزانڤانێ ب ناڤو دەنگی کورد خودێ لێ خوەشبویی ئەحمەدی خانی ل پەرتوکا بناڤو دەنگە خوە مەم زینێ دا لبارا نەوروز و جەژنا نەوروزێ دا دبێژیت:

وەقتێ وەکو شەهسەواری خاوەر
تەحویل دکر دماهی ئازەر
یانی ئاڤدار - ئادار
یەعنی کو دهاتە بورجا سەر سال
(قەط) کەس نەدما دمەسکەن و مال
روژا کو دبویە عەید نەوروز
تەعزیم ژ بو دەما دل ئەفروز
سەحراو چەمەن دکرنە مەسکەن
بەیداو دەمەن دکرنە گولشەن
خاسما عەزەب و کچی دباکر
ئەلقیسە جەواهری دنادر
تیکدا دموزەیەن و مولەبەس
ڤیکرا ل تەفەروجی مورەخەس
دەورا فەلەکی ژ بەختی فیروز
دیسان کو نوما ژ نوڤە نەوروز
یەعنی ل وی عادەتی موبارەک
شەهری و سپاهیان بجارەک
بازیرو کەلات و خانی بەردان
تەشبیه ب نژدەیان و جەردان
(صەف صەف) دمەشینە کوەو دەشتان
رەف رەف دخوەشینە سەیرو گەشتان

مامۆستا قانع لڤێ بارێدا دبێژیت:

لاوی کورد نەورۆزە ئەمڕۆ کاتی کشتوکالتە
کاتی سەیری دۆڵ و شێو و سەرکەژی خاڵ خاڵتە
تا بەکەی هەر ئارەزوی دانشتنی ناو ماڵتە
تا بەکەی کوڵ کێشی خەڵق و پووش و دڕک و ماڵتە
هۆشی نانی خۆت ببی ئەوڕۆکە وا سەر ساڵتە
چاوی نووستن هەڵبڕەو بنوارە دەشت و کوهسار

حاجی قادری کۆیی دبێژیت:

سەد وەکوو رۆستەم بە دڵ قەمچی لە رەخشی دا بەزی
وەک گەیشتنە خەندەکی دووامینی عومری دابەزی
رۆژتە ئەی بابی نەورۆزی لە بن بەفری گران
کانی پێی سڕ بوو چناریش دەستی چو پەنجەی تەزی
سونبولی زوڵف و گوڵی روخسارو سەروی قامەتی
مانگی نیسان و گوڵان نەیدی لە نیو باخ و رەزی

خودا لێ خۆشبویی مامۆستا مەلا عەبدوررەحیم (وەفایی) دبێژیت:

نەسیمی بادی نەورۆزی شەمیمی عەنبەری هێنا
بەریدی عاشقان دیسان پەیامی دڵبەری هێنا
نەوید ئەی عاشقانی دڵ نیگار یار هاتە سەر خەندە
صەدای بولبولا دیسان درەختی گوڵ بەری هێنا
مەگەر رووی کەوتە زولف و رووی حەبیبم بادی نەورۆزی
حەیاتیکی بە دونیا داوە بۆی گوڵ عەنبەری هێنا

خوا لێ خۆشبو مامۆستا پیرەمێرد دبێژیت من ئەو هەلبەستە ل ۲۱ی مارتا سالا ۱۹۴۲ دا کو نەورۆزا ئەڤ سال رێکەوت هەبو دگەڵ مانگا (رەبیعولئەولی) مانگا مەولودێ ژ دایک بونا پێغەمبەرێ گرانقدرە ئسلامی گوتیە:

رەبیعی عەرەب نەوبەهاری کورد
دەست لە ملانیان لە بەهارا کرد
جەژنی مەولودی پێغەمبەرمانە
وا مەولودمان کرد بە نەورۆزانە
ئەم دو جەژنەمان کە وا یەک کەوتن
رێی رێکەوتنە خوا یەکی خستن
ئاگری نەورۆز کە کرایەوە
بەو ئاگرە ئاگری شەڕ کوژایەوە

پاشان ل هوزانەکی دی دا دبێژیت:

ئەمرۆژی ساڵی تازەیە نەورۆزە هاتەوە
جەژنێکی کۆنی کوردە بە خۆشی و بە هاتەوە
چەند ساڵ بوو گوڵی هیوای ئێمە پێ پەست بوو تاکو پار
هەر خوێنی لاوەکان بوو گوڵی ئاڵی نەوبەهار

عەلی باپیر ئاغای دبێژیت:

رۆژی نەورۆزە کە دنیا پڕ لە سازو سوڕ ئەکا
نێرگزو لالەو وەنەوشە روی زەوی پیرۆز ئەکا
بەڵکە زێڕینە بە ئاڵاوا فەلەک هەڵی کردووە
دای لە تەبلی هەورو شایی پادشای نەورۆز ئەکا
تا ئەبەد مەمنونی لوتفی بای شەماڵم چونکە وا
پەرچەمی ئەو نازەنینە جار بە جار ئاڵۆز ئەکات



حاجی میرزا عەبدوللا کوڕی بناز ناوی (خادم) دبێژیت:

نەورۆزە ئیمڕۆ وەعدەی شادییە
جەژنی سەربەستی و هەم ئازادییە
نەورۆزی پیرۆز ڕێکەوتە شەمە
ئەم نەوعە جەژنە شازە زۆر کەمە
سروەی نەسیمی سەحەر هاتەوە
تا پشکۆی غونچە گەش بکاتەوە

مامۆستا گۆران ژی ل وێ هوزانێدا دبێژیت:

بە سوورێکی تر ئەستێرەی ئینسان گڕ
قەومی کۆنی خستەوە جەژنی ئاگر
کام قەومی کۆن کام جەژنی بەرزو پیرۆز
قەومی مادی جەژنی بڵندی نەورۆز
ئەو نەورۆزەی کە هەزاران بەهارە
لە دێی کورداگڕی ئاگر دیارە

مامۆستا محەممەد ئەمین (کاردۆخی) ژ دبێژیت:

بۆ یادی خۆشیی جەژنەکەی نەورۆز
بۆ یادی (کاوەی) نەبەردی دڵسۆز
کۆبینەوە با بە خۆشیو شادی
بۆ بیرەوەری ڕۆژی ئازادی
پێشی هەزاران ساڵ کوردانی پێشین
لە یەکەم ڕۆژی بەهاری ڕەنگین
کاتێ کوردستان وەک بووکێکی جوان
ئەڕازایەوە بە گوڵ و ئەرخەوان
ژنان منداڵان گەنجان پیران
فەلاو کرێکار گەداو شاو میران

مامۆستا بورهان محەممەد (جاهید) ژ دبێژیت:

جەژنی نەورۆز شادی و سرورە
عالەمە سەرا پا غەریقی نورە
بۆچی ئەی کوردی هەژاری بێ کەس
دائم ئەخەوی لە بەندو قەفەس
ئەم جەژنە جەژنی کوردو شادیە
ئەوەی ئەزانی مەعلوم عادیە
کوردە بەسیەتی جەهل و غەفلەتی
ئەم بێهۆشیەت چییە عیللەتی

مامۆستا هێمنی خودێ لێ خۆشبویی ژ دبێژیت:

چلەی زستانی ناخۆش بوو تەزووی سەرمایە پیاوی سڕ
دەکردو کوچەو کۆڵان لە بەفرو لیتە بوو بوون پڕ
بەهار هاتو دەخەملێ کێوو دەشت و بەندەن و لاخڕ
ڕەفیقان ڕۆژی کوردانە بەهارە جێژنی نەورۆزە
بە دڵ لێتان دەکەم لەو ڕۆژەدا من جێژنە پیرۆزە

شێخ نەجمەدین (صابری) دبێژیت:

نەسیمی (صبح) دەم موژدەی بەرهاری حوسنی یاری دا
نیشانەی جەژنی نەورۆزی لە شاری دیاری دا
کە داخل بوو بە شاری دڵ سوپاهی حاکمی عادل
دزو جەردەی غەمو (غصە) لە ترسی ڕوحی غاریدا

مامۆستا قادر برسی و نەورۆز:

لەم ڕۆژە دا بوو کاوەی ئاسنگەر
تاجی سەر بەستی و مەردی کردە سەر
پێش دا مانەکەی خۆی کرد شیعار
بەرامبەر کۆشک و تەلاری زۆردار
بە دەنگی بەرز بە تووند ئەی نەڕاند
بمرێ زۆرداری لە هەموو جیهان
بمرێ زوحاک و ماری سەر شانی
بژی تێکوشان بۆ کامەرانی

ل ئاخریا گۆتارا خوەدا دێ دو پارچە هوزانا ژ دو خوشکێت هێژا (خاتون خورشیدە بابان و خاتون میهربانێ) کەینە دوا بریا هۆزانێت نەورۆزێ و مەتالا خوە بڤێ هیڤیێ کو بدلی ڤە خواندڤانێن گۆڤارا ئاوێنە و هەمی کوردان بیت، ڤیجا ئەوە ژی هوزانا خوشکە خورشیدە بابانێ:

گەل ئەمڕۆ شادە دڵ پڕ لە سۆزە
گوڵی سەربەستی دیاری نەورۆزە
کەژو دەشتو دۆڵ هەردێ کوردستان
جوانتر ڕازاوە لە جاری جاران
ئاگری نەورۆز لە لوتکەی بەفرین
ئەیهێنێ مژدەی شەفەقی زێرین

خاتون میهربان ژی دبێژیت:

نەورۆز ئەی کلپەی دەرونی سووتاوە
ئەی خوێنی گەشی لە دڵ هەڵقوڵاو
ئەی سۆزەی بولبول ئەی شنەی شەماڵ
پێتی ناوەکەت خوێنی گەش و ئاڵ
ئەی لەنجەی سەروو ئاوازی چنار
قاسپە قاسپەی کەو تۆی بوکی بەهار
بە خێرا بێی یا خوا لەنجەی نازت کرد
ئازادیت هێنا بو نەتەوەی کورد
هیوای ژیانی جوان و ڕەنگینی
لای هەمو کوردێک بەرزو سەنگینی

# زەماوەند

• مەهاباد – خورشید سوّفی خزری



خۆشەویستان ئەگەر راستان دەوێ، ئەمن لە نێو کۆمەڵی ئێستادا زۆر قسەزان و ژیرو بە هۆش نیم، بەڵام هی وا هەیە کە تەنانەت ئەمنی گێژیش وشیار دەکاتەوەوهانم دەدا هەتا ئەوەی دەیبینم بیخەمە ژێر زەرەبینێکی زۆر وردبینەوە.

پێویستە بڵێم ئەمن ئەگەر ناو گەلێک یا کەسانێکی دەو بابەتە دەخەمە ژێر رەخنەو ئینتقادی خوّم، ئەوە بەو هۆیە نیە کە هەموو چینو توێژەکانی گەلەکەمان ئەو جۆرەن، بەڵکو زۆر هەن لە پیاوان و ژنانی ئێمە کە نە تەنیا بنەماڵەکەیان، بەڵکو کۆمەڵیش شانازیان پێ دەکا. جا هیودارم بزەیەکی هەرچەند بچووک لەسەر لێوەکانی ئێوە خۆشەویستانی بەرێز ببینم، ئیتر سوپاس.

ئێستا زۆر بە پەلەم لەبەر ئەوە کە بڕیار وایە مام خدری جیرانمان بچێتە خوازبێنی تەنە خەجێ کە ئەویش هەر هاوسێی خۆمانە، راستیتان بوێ ئەمن زۆر خۆشم لە ئەو جۆرە زەماوەندانە نایە، بەڵام لەبەر دڵی هەردوو لایان دەبێ هەر بچم.

ماڵی مامخدر دوو نهۆمەو پلەیەکی زۆریان هەیە، بەڵام بایەخی ئەوەی هەیە کە پیاو ماندوبێ، ئەگەر زۆری هەڵنەکێشم دەتوانم بڵێم خانووی وا لەم شارە نیەو یان ئەگەریش هەبێ زۆر کەمە.

مامخدر لە لای سەرەوە دانیشتوە، پیاو شەرمی لێ ئەکا. پیاوێکی بە ساڵاچوو و دونیا دیدەیە، لە بنەوەرا چاوی لێ ئەکەم، یا خوا لە چاوی پیس بە دوور بێ، رانکو چۆخەی بیستو پێنج هەزار تمەنی، کەوشو کەلاشی دووازدە هەزار تمەنی، پێنچەکەی پێموایە لەو ژوژیاتانەیە کەوا هێشتا نەهاتوّتە ئەم شارەوە، پشتێندەکەی حەریرە، سۆرانی مەل مەلی سپی یا خوا لە پشت بە جێمێنێ! سەرو رووی چاو لێکە شەش تیغەی کردووەو سمێلەکانیشی رەش کردۆتەوە، من هەروا راماوم کە مام خدر بە دەنگێکی مەستانەو ئاشقانەوە بەخێرهاتنم دەکا، منیش خێرا گوتم: زۆرت لێ مەمنونم، مەبارەکیش بێ مام خدر گیان، دیار بوو مام خدر ئەم مامە مامەیەی پێ خۆش نەبوو، حەقیش بەوی بوو، ئاخە پیاو بە زاوا ئەڵێ مامە؟ جەرگەرەشە گرم هەر کوێ دەچم کارێک ئەکەم کە ئیتر نەمدوێنن.

کچ و کوڕەکانی مام خدر لە مەجلیس دانیشتبوون و نەوەکانی دەهاتن و دەچوون. بە شۆخی گوتم: دەڵێم بۆ

شریتێکی خۆش لێ نادەن؟

چما شۆخیم لێ نەبوو بەڕاستی، مام خدر گوتی. ڕاست دەڵێ، باشە هێندەیش بێ ئەقڵ نیە، زانیم مەبەستی چیە. گوتم: بەڵێ کاک خدر گیان، زۆر خۆشی لێ هات! گوتی: کەوابێ هەستە تۆزێک هەڵپەڕین، منیش بە شۆخییەوە گوتم: من بە تەنیا هەڵناپەڕم، گوتی: ئەدی بۆ خۆم مردووم، جا وەرە بە دەستی خۆم چم لە خۆم کرد!

مام خدر پێی داگرتبوو، پێم وایە دەیویست نیشان دا کە هێستاش هەر جەحێڵە و دەتوانێ هەڵپەڕێ. ئیدی کەس نەبوو بە هاواری منی کۆڵەوارەوە بێت. بە خوا دەتگوت دیوار بەسەرمدا رووخاوە، سەرچۆپیەکەی گرتبوو، بەری نەدەدا، ناچار گوتم: ئەمن دەچمە دەرێ، گوتی: ماندوبووی؟ گوتم: مردم، گوتی: بزانە، گوتم: ئەرێ وەڵا کاک خدر گیان لە سەدی وەک من جەحێڵ تری.

مام خدر بانگی نەوەکانی کردو گوتی: تا ئێوارێ دەبێ هەڵپەڕن، نەوەی فەقیر نەیان وێرا هیچ بڵێن. سەعات گەیشتە دوازدە و نیو، ماڵی مام خدر ئیدی جێگای کەسی تیادا نەدەبووەوە، پڕ بوو لە ژن و پیاو. نانی نیوەڕۆمان خوارد. چەند نەفەرێک دەگەڵ مامۆستا و زاوا وەرێ کەوتن بۆ ماڵی بووک، منیش دەگەڵیان چووم، ئاخر مام خدر دەستووری دا چەند ژن لەبەر نەنەخەجێ بێن، منیش چووم سەد خۆزگەم بەمامخدر، نەنەخەجێ وای لە خۆ کردبوو کەس نەی دەناسیەوە.

چارشێوی سپی بە خۆی دادابوو، هێندەی کل لە چاوی کردبوو، دەتوت کێوی ئاتەشفشانە هەڵقوڵیوە، قژی سەری وەک قەتران رەش کردبوو، دیار بوو چەند جاری خەنەو رەنگ لێداوە، دەستی هیچ، لاقیشی دەخەنە دابوو، جا سەرباتی هەموویان هێندی سپیاو لەسەر و چاوی هەڵسووبوو، لەباتی وەی سپی هەڵگەڕێ شین هەڵگەرابوو، بسکی وەک کچۆڵان هێنابووە سەر رووومەتەکانی.

مامۆستا دەستی پێکرد، گوتی: قەرارو بڕیارتان چۆنە؟ مام خدر گوتی: ئەمان پێکەوە تەواو بوو، نەنەخەجێ گوتی: ئەمن بە حزووری مامۆستا دەمەوێ کوڕەکانیشت گوێیان لێ بێ تا سبەینێ بەهانانم لێ نەبیننەوە. مام خدر گوتی: کوڕی من رازین و نوکری تۆن.

کوڕی فەقیر سەریان داخست و چیان نەوت، نەنەخەجێ دەستی پێکرد. نازانم چەنەی بۆ شل نەدەبوو؟ بەڕاستی من گوێم ماندووبوو. نەنەخەجێ دوو، سێ فرمێسکی هاتە خوارو گوتی: بە خودا من قەت خۆشیم لە خۆم نەدی، بابم زوڵمی لێکردم، بەڵام ئەلحان بۆ خۆم هەقداری خۆمم، جا پێیتان بڵێم دەبێ ئاشپەز بگرن، دەهۆڵ و زوڕنا مۆدی قەدیمە، ئەوی دیکە بێنن، لە زۆران بگێڕنەوە، کەیفی خۆتانە چەند رۆژ شایی ئەکەن، بەڵام من سێ دەستم لیباس دەوێ. نەچن پشتێنی ناحەسڵم بۆ هەڵگرن، هەرسێک حەسڵ بن، وەک ئەو بووکە فروجانە چوار گەزم ناوێ، دەگەز نالێم، هەشت گەزم بەسە، دەسماڵان حەسڵ بن، کراسێک مەخمەلی رەش بێ، دوانەکەنی دی یەکیان کرێشەی ئەندۆنزیو ئەوی دیان ژوژێت بێ. هێندێک لیباسی ترم دەوێ دەگەڵ حاجی دەچم و دەی کڕم.

پێنج لیرەی دەورەگیراو، دوو بازنەی کوردی، لەو ئەنگوستیلانەی تازە داهاتوون و نقێمیان سپی یە، لە جێگەی ئالقە دەمەوێ، گوارەی پیالە زەنگیتان لە بیر نەچێ، هیچی دیکەم ناوێ. رووی لە حاجی کردو گوتی: بە ماشێنی کوڕەکانت نایەم، دەبێ بۆ خۆت ماشێن بگری. ئاخر هەموو رۆژان پیاو پێ ئیرادە ماشێنیان لێ وەرگری، خزمو کەسمان زۆرن بانگێشتمان دەکەن، خۆ بە پێیان نابێ بچین، پێم وابوو مام خدری بێ چارە قەت سواری کەریشی نەبووە! تا ئێستا بیەوێ دوای شێست، حەفتا ساڵ ماشێن لی خوڕی.

هەموو جەماعەت پاڕانەوە، ئاخر مام خدر کوا دەتوانێ ماشێن لی خوڕێ. گوتی: نازانێ دەبێ فێر بێ، گوتیان: بەڵێنی دەدا حەتمەن فێر بێ بە سەت پاڕانەوە هەتا نەنەخەجێ رازی بوو، رۆژی بووکێ، زاواو بووک لە پشتەوە سوار بوونو شوفێرێک ماشێن لی خوڕێ کلکی وشتر گەیشتە عەرزێ!

وردە فەرمایشی نەنەحەجێ هێن زۆر بوون، دوایی نەدەهات ئاخرەکەی کوڕەکانی مام خدر بە هاواری هەموومان گەیشتن و گوتیان هەرچی ئێوە بڵێن وا ئەکەین.

نەنەخەجێیان لەسەر پێنج سەد سکەی بەهاری ئازادی مارە کرد. ئەی خوا موبارەکی نەکا، جا ئەوە بێت و مام خدر بمرێ دەبێ کوڕەکانی توورەکەی سواڵ بکەنە مل.

رۆژی بووکێ کەس نەی دەوێرا هەڵنەپەڕێ، ئەگەر لە تونیان خنکابان نەدەبایە لە شایی هاتبالەدەرێ، یەکێک هەر ئاوی بە دەمەوە دەکردن، پەنجا شێست ماشێنی تازەو نوێ لەبەر دەرگا راوەستا بوون.

ئاخر ئەو دوو هەنگاوە ماشێنی بۆچ بوو؟

نەنەخەجێ گوتی: من لە خەڵک کەمتر نیم.

کاتێک دوو برازاوا بووکیان هێنا دەرێ چەپۆکێکم بەسەری خۆم دادا، ئەیەڕۆ، نەنەخەجێ ئەو دەسماڵەی بۆ هێناوەتە نێوەی دەم و چاوی؟ لە هەموویان تەباحەت تر ئەو گوڵە زەلامە سوورەیە، وەڵا تیرمان خوارد، جا ئەو بوو بە کار؟ ئەدی جەحێڵەکان دەبێ چ بکەن؟

چوار دەورەی شارمان کرد، دووربینی فیلم هەڵگرتن وچانی نەبوو، هەتا ئاخرەکەی بەرەو ماڵی زاوا گەڕاینەوە.

هەروەک گوتم ماڵی زاوا پلەکانەیەکی زۆر بوو، بووکیان دەست گرت و زاوا لە پێشیدا دەڕۆیشت، بووک سێ چوار پلێکان رۆیشتە سەرێ، ماندووبوو، پێی عەیب بوو بڵێ ماندووبووم، ددانی بە جەرگی خۆی داگرت بوو. بەڵام دوو سێ پلێکان مابوو هاواری لێ هەستا. بووک کە ئاسمی بوو، بێحاڵ کەوت. زاوا کە ئەمەی دی زەفتی هاتە خوار، بووک و زاوا هەر یەک لە لایەک کەوتن، سێ چوار کەس بە پەلە هەردووکیان بردنە ژووری، پاش سەعاتێک کە وەخۆ هاتنەوە حاڵی بوون کە پیرنو حەجێل نین.

# به یادی کەریم ئەیوبی



نووسینی: لیزا ساپان
وەرگێر لە ڕووسی: سورەییا مەولانی
وەرگێر لە فارسی: دڵشاد خۆشناو

تێبینی: ئەم نووسینە، چاوپێخشانێکی کورتی ژیانی خوالێخۆشبوو پرۆفسور عەبدولکەریم ئەیوبی یە، لە یەکێک لە رۆژنامە هەفتەیی یەکانی مۆسکۆ چاپ کراوە.

کەریم ئەیوبی لە رۆژی ١٢ی نیسانی ١٩٢٤ لە شاری مهابادی کوردستانی ئێران چاوی بە ژیان هەڵێناوە. خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی لە هەمان شار تەواو کردووە. بۆ خوێندنی ئامادەیی روی کردۆتە شاری ورمێ. لە ساڵی ١٩٤٦ - ١٩٤٥ ئەندامێکی کارا بووە لەپێکهێنانی کۆماری مهاباد، دژ بە هێزەکانی رژێمی شا لە ئێران.

لە ساڵی ١٩٤٦ لەگەڵ گرۆپی لاوان رەوانەی یەکێتی سۆڤیەت کران بۆ ئەنجامدانی مەشقی سەربازی، چونکە کۆماری مهاباد پێویستی بە کادری پلە بەرز هەبوو.

دوای لەناوبردن وسەرکوت کردنی کۆماری مهاباد و تەشەنەکردنی کێشە سیاسیەکان نەیتوانی بگەڕێتەوە وڵات و هەر لە یەکێتی سۆڤیەت مایەوە.

ماوەی ١٠ ساڵی تەمەنی، واتە لە ١٩٤٦ تا ١٩٥٦ لە باکو بە سەری برد، ئەو شوێنەی کە مەشقی تۆپخانەی تێدا تەواو کردبوو. بەڵام ئیش و کاری ژیانی لە وڵاتی نوێدا بووە چالاکی هونەری و رۆشنبیری لە زەمینەی زمان و ئەدەبی کوردی، ئەوەش تاکە سەبوری ی بوو بۆ خزمەت کردنی هاوزمانانی.

لە ساڵی ١٩٥٦ خەریکی خوێندنی دەورەی دوکتورای (LO)ی ئەنستیتۆی رۆژهەڵاتناسی (Ansssr)بوو.

لە ساڵی ١٩٦٣ بڕوانامەی دوکتوراکەی نووسی کە بریتی بوو لە چۆنیەتی داهێنان لەسەر شیعری شاعیر و زانای هاوچەرخ (هەژار)، هەژار دۆستی منداڵی و لاوی ئەو بوو.

کەریم ئەیوبی جگە لە زمانی کوردی و رووسی، زمانەکانی فارسی و تورکی و ئازەری و عەرەبی و فەرەنسیشی بە چاکی زانیوە

ماوەی ٣٦ ساڵ لە بواری ئەکادیمی و زانستی کارکرد کە ٣٢ ساڵی لە ئەنستیتۆی زمانناسی A.N بوو.

هاوکاریی هاوسەرەکەی خاتوو ئیونیا سمیرنۆڤا دکتۆرای «زانستی زمانناسی» کاریگەری زۆری هەبوو لە ژیانی هونەری و چالاکی یە ئەدەبیەکانی. لە ساڵی ١٩٦٨ یەکەمین بەرهەمی هاوبەشیان چاپ کرد بەناوی «دیالیکتی کوردی موکری» کە تێیدا بۆ یەکەمین جار لە هەموو بواریکەوە باس لە لەهجەی (دایکی) کەریم ئەیوبی کراوە.

ساڵی ١٩٨٥ کارێکی مەزنی دیکەشیان بە چاپ گەیاند، بەناوی (فونەتیکی زمانی کوردی).

لە ساڵی ١٩٩٤ شیعرەکانی مەلای جزیری) شاعیری بەناوبانگی کلاسیکی سەدەی (١٦و ١٧) وەرگێڕاوە.

جگە لەمانەش ژمارەیەکی یەکجار زۆر وتاری دەربارەی زمانی کوردیو مێژووی کورد بلاوکردۆتەوە.

لە ساڵی ١٩٩١ بۆ جاری یەکەم لە ماوەی ئەو هەموو ساڵەدا بواری گەڕانەوەو دیداری وڵاتی بۆ رەخساو چاوی بەوانە روون بووەوە کە ٤٥ ساڵ بوو بە حەسرەتی دیدەنیان بوو. وڵات و خزم و دۆستان بە گەرمی و سۆزی خۆشەویستی باوەشیان بۆ کردەوەو لەو سەفەرەیدا سێ مانگ مایەوە. بەڵام سەد حەیف ئەوە یەکەمین و دوایی ین دیدەنی بوو، هەر چەندە خۆشی خوازیاری چەند بارەبوونەوەی بوو.

کەریم ئەیوبی لە ساڵی ١٩٩٥ لە شاری (سنکت پترس بورگ) کتوپڕ بۆ دوایی ین جار چاوەکانی لێکنا، هەرچەند ژیانی زۆر خۆشدەویست و هیچ کاتێک بیری لە مردن نەدەکردەوە، بەڵام گوتبوی کە لە خاکی وڵات بینێژن، ئەو ئارەزووەشی هێنرایە دی... یادت هەر نەمر بێ دۆستی ئازیز.

ئەستریک ئەیوبی تەمەن ٨ ساڵە، بەم جۆرە هەستی خۆی بۆ یادی بابەگەورەی دەردەبڕی:

(من بابەگەورەم گەلێک خۆشدەویست و ئەویش منی خۆشدەویست. من بە تایبەتی دوو رەوشتی بابەگەورەم زۆر پێخۆش بوو، یەکەمیان باوەڕ بە خۆ بوون و هێمنی بوو، ئەوی دیکەشیان ئەوە بوو کە هەموو شتە لە کارکەوتوەکانی ماڵەوەی هەمیشە بە خۆی چاکی دەکردنەوە، «لەیستۆک، دیکۆر و تەزئین و ... هتد»

باوەگەورە خۆی فلوتێکی دروست کردبوو، بەو فلوتە ئاوازی کوردی بۆ دەژەنین «من و تانیا»ی خوشکم بەشێکی ژیانی ئەو بووین، زۆر شتی ژیانی خۆی فێرکردین. هەمیشە حەزی دەکرد دیاریمان پێشکەش بکات، ئەو هیچکات لە هیچ شتێک نەدەترسا، من بەسەرهاتەکانی باپیرەم زۆر پێخۆش بوون. جارێکیان شەو بوو و هەموومان نووستین، لەنکاو بابەگەورە دەنگێکی بیست، لە چادر هاتە دەرێ و مارێکی دیت، بابەگەورە دارێکی هەڵگرت و ماری لە دەورە پێچا، بەو جۆرە ئەو کەروێشکەی رزگار کرد کە مارەکە بۆی هاتبوو.

باپیرەمان زۆر میهرەبان بوو، ئێمە هەمیشە خۆشمان دەوێ و یادی دەکەینەوە.

* * *

با ئێمەش ئەمەی لێ زیاد بکەین: پرۆفیسۆر ئەیوبی بەو چەشنەی کە یەکێ لە خوێندکاران دەیگێڕایەوە مرۆڤێکی خواناس و بە ئیمان بوو. پتر لە ٥٠ ساڵ لە وڵاتێکدا ژیا کە مارکسیسم بە سەریدا حوکمی دەکرد، بەڵام ئەو رۆژ بە رۆژ باوەڕی بە خودای گەورەو ئایینی پیرۆزی ئیسلام زۆرتر دەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا تا بەرزترین پلەی زانستو زانیاری دەرسی خوێندو سەدان قوتابی فێری زانیاری و باوەڕی بەتین بە خودای تاقانە کرد.

ئەو هەڵکەوتووە خۆشەویستە ئینسانی باردێنا - یادی بە خێرو وێنەی زۆر بێت.

«ئاوێنە»



# دوایین دەرس

ئالفونس دوده (۱۸۷۹-۱۸۴۰)

وەرگێرانی لە فارسی: شاباز موحسینی

جـوان لە بـیرمە ئەوڕۆژە بـۆ مـەدرەسە تۆزێک وەدرەنگ کەوتبووم، هەر بـەم بـۆنەوە زۆر لە مـامۆستام دەتـرسام. بە تـایبەت کـە وتبووی باسی نـاوی کـارا (ئـیسمی فـاعیل)و ناوی بەرکار (ئیسمی مەفعوول) دەپـرسمەوەو منیش هیچم لەم باسە نەدەزانی. راستت دەوێ لە پێشدا دەمەویست گوێ بدەمەقسەی شەیتان ونەچمەوە مەدرەسەو ملی رێگە بگرم و بچمە دەرو دەشت. تاوێکی ئێنگجار خۆش بـور و هەوایش زۆر دڵپەسەند بوو. دەنگی تەقە تەق لە باخـاتەکانی دەورو بەرەوە هەراوهوریایەکی بەرپا کردبوو. لە پشت کارگەکانی دارتاشییەوە دەنگی مەشقی سەربازە ئالمانیەکان دەگەیشتە گوێ. وام بیر دەکردەوە شێتی‌یە ئەمانە وێڵ بکەم و بڕۆمە مەدرەسەو ئەسیری ناوی کاراو ناوی بەرکار ببم. بەڵام دوای کێشەیەکی زۆر لەگەڵ خۆمدا لە کەری شەیتان دابەزیم و خێرا بەرەو مـەدرەسە کـەوتمە رێ. لەبـەر پـاسگادا دیـتم خـەڵکی کـۆبوونەتەوەو ئـەو ئاگـەداری‌نـامانەی بـە دیـوار دا کـوترا بـوون دەخوێننەوە، چونکە دووسـاڵ بـوو هـەرچی ئاگەداری نامەیان ئەدا لە دیوار، باسی بەزینی ئـێمەو سـەرکەوتنی ئـالمانیەکـان و حـوکمی فەرماندەی نیزامی ئالمان بوو، بـە بـێ ئـەوەی لەوێ ماتڵ ببم، وتم: خودا دەیزانێ هـەمیسان چ خەونێکیان بۆمان دیوە،... تێپەڕیم، بـەڵام ئاسنگەری گوندەکەمان کـە دەیـناسیم لەگـەڵ شاگردەکەی لەوێ دا وەستا بوون و ئاقەزەکانی دیواریان دەخوێندەوە. کاتێک دیتی کە بـەرەو مەدرەسە هەڵدێم، وتی: بـە قـوربان! لە خـۆ ڕا رامەکە دواناکەوی...!!! پێم وا بوو کابرا دەیەوێ گاڵتەم پێ بکا، گـوێم نـەدایـە و رۆیشـتم. بـە هەناسە بڕکە چوومە نێو مەدرەسە.

تەنیا دڵخۆشیم ئەوە بوو کـە لە سـەرەتای دەرسدا شاگردەکـان دەنگ هـەڵدێنن‌و دەست دەکەن بە هاوار و قیژە قیژو بە هۆی جیرەجیرو خشەخشی کـیف‌و هـەروەها بـە بـۆنەی قـیژو واژی منالەکان کە دەست دەخـەنە گـوێیان و دەرس لەبەر دەکـەن کـەلاس دەبـێتە حـەمامی ژنـانەو مـنیش بـە ئـەسپایی و لەسـەر پـەنجە دەچمە نێو کەلاس و دەڕۆمە سەر جێگاکەم؛ بە بێ ئەوەی مامۆستا -کە لەم کاتەدا بە خەتکێشە ئاسنیەکەی هەر لە پەسا لە مێزەکە دەداو هاوار دەکا: قوزەڵقورت... بێدەنگ بن... - پێم‌بزانێ. بەڵام دیتم وەکوو ئەوەی کە هیچ گیانلەبەرێک لە کەلاسـدا نەبێ دەنگ لە کەسەوە نایێ.

لە پەنجەرەکەوە تەماشای نێو کەلاسم کرد بینیم هاوکەلاسەکانم هەموویان لەسەر جێگەی خـۆیان دانـیشتوون و «مـیسیۆ هـامێل»ی مامۆستامان هەمان خەتکێشە نابارەکەی دابووە ژێر باڵی و لە کەلاسدا هات و چۆی دەکـرد. چارەم نەبوو جگە ئەوەی نەبێ هێواش دەرگـا بکـەمەوەو وەک مشکی مـردوو بـچمە نـێو کەلاس. لە ترسان زەرد هەڵگەڕا بووم، بەڵام...



نەخێر، میسیۆ هامێل تا چاوی پێم کەوت، بێ ئەوەی رووم لێ تاڵ بکا، وتی: «زوو برۆ سەر جێگاکەت خەریک بوو بە بێ تۆ دەرسەکەمان دەس پێ بکەین...» بررووسکە خۆم گەیاندە جێگەکەم و دانیشتم. دوا تۆزێ کە هەناسەم هاتەوە جێ و گیانم پیا هاتەوە بینیم کە مامۆستاکەمان لیباسی پلاو خواردنەکەی لەبەر کردووەو یەخەو سەردەستە هاوریشمیەکانی (کە تەنیا لەکاتی ئەزموون و خەلات بەخشین دا دەیدا لە لیباسەکانی) لێداوە. سەرەڕای ئەمە یەکسەر کەلاس حاڵەتێکی غەریب و نامۆ و رەسمی بوو. ئەوی زۆرتر بووە هۆی سەرسوورمانم ئەوە بوو کە لەسەر مێزو سەندەڵیەکانی ئاخری کەلاس کە هەمیشە خاڵی دەمان، هەندێ خەڵکی دێ و هەروەها کارمەندی پێشووی پۆستخانەو کوێخای قەدیم و باوە هوسێر - کە کڵاوێکی سێ سووچی لەسەر دابوو - ئارام‌و بێدەنگ دانیشتبوون. هەموو ماتەمین و خەمبار دەهاتنە بەرچاو. نازانم لەکوێوە باوە هوسێر کتێبێکی ئەلف و بێی کۆن و مشک خواردووی گیرهێنابوو و لەسەر چۆکی کردبوویەوە و چاویلکە بن ئیسکانیەکانیشی لێ دابوو و هەر چاوێکی کردبوو بە چوار و سەرنجی ئەو کتێبەی دەدا.

لەم کاتە دا مامۆستا بە هێمنی زۆرەوە چووە سەر کورسی و بە دەنگێکی نەرمەوە رووی کردە شاگردەکانی و وتی: منالە خۆشەویستەکان! ئەمڕۆ دوایین رۆژە کە پێکەوەین و من دەرستان پێ دەڵێم. لە بەرلینەوە حوکم هاتووە کە لەمەو لا نابێ لە مەدرەسەو قوتابخانەکانی «ئالزاس» زبانی فەرانسە بوترێتەوەو سبەینێ مامۆستای زبانی ئاڵمانی دێتە ئێرە. ئەمە دوایین دەرسە کەئەوڕۆ بە زبانی فەرانسە دەیخوێنین. تا بۆتان دەکرێ جوان بۆ دەرس گوێ بگرن.

دوای بیستنی قسەکانی مامۆستا حاڵم وەها تێکچوو کە باسی ناکرێ. فکرم چوو بۆ ئەو قاقەزانەی کە لکاندبوویان بە دیوارەوە و زانیم کە ئەو ماڵ کاولانە چ حوکمێکیان کردووە. بیرم کردەوە کە چۆن ئەمە دوایین دەرسی فەرانسەی منە؟! منێک کە هێشتا فێری نووسین نەبووم. ئەگەر بەڕاستی کار وەهای لێ بێ، قوڕی کوێ بشێلم؟ بیرم چوو بۆ ئەو کاتانەی کە دەچوومە سەر سەهۆڵەکانی سەر چۆمی دێ و خلیسکێنم دەکردو دەکەوتمە شوێن مەل‌و باڵندەکان؛ زۆر ناڕاحەت بووم کە لە دەرس و مەدرەسە دوا

کەوتووم. کتێبەکانم کە هەمیشە باری سەر شان و هۆی ئازارم بوون، لەم کاتەدا بوونە هەڤاڵێکی خۆشەویست کە نەمدەویست هەرگیز لێیان جیا ببمەوە. تەنانەت کتێبی ڕێزمان و کتێبی مێژوی پیرۆزیش نرخ و گرنگیان لە لام پەیدا کرد. لە هەموو زیاتر دڵم بۆ مامۆستای هەژار دەسوتاو بیری دووری لەو وەهای ناڕاحەت کردم کە شەپلاخەو لێدانەکانم لە بیر چۆوە. مامۆستای پیر بە هۆی حورمەتی ئەم دوایین دەرسەیە کە باشترین لیباسی خۆی لەبەر کردووەو ئەم ریش سپیانەش کە بۆ ماڵاوایی هاتوون و لە ئاخری کەلاس دانیشتوون، دیارە خەفەت دەخۆن کە بۆچی پتر نەهاتۆنەتە ئێرە تا زمانی فەرانسە چاکتر فێر ببن، لە لایەکی دیکەشەوە ڕیستوریانە بەم کارە لە خزمەت و دڵسۆزی چڵ ساڵەی میسیۆ هامێل ڕێز بگرن و ئەرکی خۆیان سەبارەت بە نیشتمانی لە دەس چوو بەجێ بێنن. لەم کاتەدا بوو کە مامۆستا منی بانگ کرد کە وڵامی دەرس بدەمەوە. خوا دەیزانێ حازر بووم گیانم بدەم و بتوانم یاسای ناوی بەرکار (ئیسمی مەفعوول) یەک جێ و بە بێ هەڵە بڵێمەوە، بەڵام بەداخەوە هێشتا دەمم نەکرد بۆوە کە زمانم گیراو کەوتمە گۆمی خەیاڵ و ئاگام لە خۆم بڕاو پەلم داو خەریک بوو دەس کەمە گریان، بەڵام سەرم لە خەجاڵەتا داخست و بیستم کە میسیۆ هامێل ئەیوت: ڕۆڵە گیان ئێستا دەبینی ئاکامی هار و هاجی چیە؟ هەموو ڕۆژێ پیاو دەڵێ هێشتا وەخت زۆرە سبەینێ فێر دەبم، بەڵام لە پڕ دا ئاگادار دەبێ کە چەرمەکە ئاو بردویە. بەڵێ ڕۆڵە گیان چارەڕەشی ئێمە ئەوە بوو کە هەمیشە لە هەر کاتدا کاری فێربوونمان خستە سبەینێ. ئێستا ئەمانە حەقیان تیە بە ئێمە بڵێن چۆن ئێوە دەڵێن فەرانسەیین لە حاڵێکدا نەدەتوانن بخوێننەوەو نە بنووسن؟! کاکی من! هەر تۆ خەتابار نیت، هەموومان خەتابارین. دایک و باوکی ئێوە لە فکری دەرسەکانتانا نەبوون و بۆ پەیداکردنی چەند شایی یەک ئێوەیان دەنارد بۆ کشت و کاڵ یان بۆ کار لە کارخانە. مەگەر منیش خەتابار نیم کە بەجێی ئەوەی بە ئێوە دەرس بڵێم، ئێوەم دەنارد بۆ ئاودان بە باخچەو بۆ خۆیشم دەچوومە ڕاوەماسی؟!

درێژەی قسەکانی مامۆستا گەیشتە باسی زمان و فەرموی: زمانی ئێمە شیرینترین زمانی دنیایە. لە هەموو زمانەکانی دیکە خۆشترو ڕەوانترە. دەبێ لە پاراستنی دا زۆر هەوڵ بدەین و قەد لە بیر نەبەینەوە میللەتێ کە ئەسیری بێگانە بوو تا کاتێک زمانەکەی پاراستبێ وەکو ئەوە وایە کلیلی زندانەکە لە دەست خۆیدا بێ.

پاشان کتێبی ڕێزمانی کردەوەو دەستی کرد بە وتنی دەرس. زۆرم لە لا سەیر بوو کە بە باشی و ڕێکو پێکی لە قسەکانی مامۆستا و دەرسەکەی حاڵی دەبووم. ڕاستە کە من باش گوێم بۆ گرتبوو، بەڵام ئەویش هەرگیز بەم جۆرە دەرسی پێ حاڵی نەدەکردین. وەک بڵێی پیرە پیاوی داماو دەیویست هەموو زانست و خوێندەواری خۆی پێش لە ماڵاوایی بڕژێنێتەوە مێشکمانەوە. دەرس کە تەواو بوو دەستمان کرد بە نووسینی مەشق. میسیۆ هامێل بۆ هەموومان سەرمەشقی تایبەتی ئامادە کردبوو و بە خەتێکی گەورەو بەرچاو، لەسەر سەفحە ڕەنگینەکانیەوە ئەم وشانەی نووسیبوو: فەرانسە - ئالزاس، فەرانسە - ئالزاس. سەرمەشقەکانمان کە وەک جاران لکاند بەسەر قوتوەکانی بەرامبەرمانەوە هەر دەتوت بەم هۆیەوە ژوورەکە پڕ بووە لە ئاڵای شەکاوەی بچکۆلە. شاگردەکان لەو پەڕی وردی دا خەریکی نووسین بوون و جگە لە خشە خشی پێنووس دەنگێک نەدەبیسرا.

دوو سێ زەردەواڵە «زەرگەتە» هاتنە نێو کەلاس و دەستیان کرد بە ویزەویز، بەڵام کەس تەمەشایانی نەکرد، تەنانەت منداڵە زۆر چکۆلەکانیش کە خەریکی کێشانی خەتی لارو وێر بوون، هەر سەریان بەرز نەکردەوە. لە سووچێکی سەر بانی مەدرەسە کۆترەکان خەریکی گمە گم بوون و بە ئەسپایی لەگەڵ یەکتر ڕاز و نیازیان دەکرد. بە خۆمم وت: بڵێی بەمانیش حوکم کەن کە بە ئاڵمانی گمەگم بکەن؟! جار جار سەرم بەرز دەکردەوەو تەماشای مامۆستام دەکرد، دەتگوت مامۆستا بیرەوەری ساڵە پێشوەکان لە دارو دیواری قوتابخانەدا دێنێتەوە یاد و بە کەسەر و تامەزرۆییەوە دەڕوانێتە هەموو سووچ و قوژبنی مەدرەسە کە دەمێ ساڵ لەوێدا دەرسی وتووەتەوە.

چڵ ساڵە کە مامۆستا لەم ماڵە دایەو هەر لەم ژوورە دا دەرسی وتۆتەوە، تەنیا گۆڕانکاری ئەمەیە کە مێزو سەندەڵیەکان بە درێژایی زەمان لە ژێر دەست و پێی شاگردەکان سوواون و بریقە و ڕەنگ و ڕوویەکی تایبەتیان پەیدا کردووە... لە حەوشەی مەدرەسەیش دار گوێزەکان گەورەتر بوون و لاولاوێکیش کە مامۆستا بە دەستی خۆی چاندبووی بووەتە هۆی ڕازانەوەی دەرگا و پەنجەرەو گەیشتووەتە گوێ سوانەی بان. جیابوونەوە لەم ماڵە کە هەموو بستێکی حیکایەتێکی مێهرو خۆشەویستی یە بۆ مامۆستای بەستەزمان، زۆر تاڵ و ناخۆش بوو، بەڵام هیچ چارەیەکیش نەبوو. ناچار بوو سبەینێ لەگەڵ ئەم مەلبەندە ماڵاوایی یەکجاری بکاو بەرەو شوێنێکی دیکە بڕوا. خوشکە پیرەکەیشی خەریکی کۆکردنەوەو پێچانەوەی جانتاکانی بوو. لەوە دەچوو هات و چۆی ئەو براکەی زۆر پەرۆش کردووە. بەڵام مامۆستا بەوپەڕی هێمنی یەوە دەرسەکەی تەواو کرد.

لەدوای مەشق، دەرسی مێژوو دەستی پێکردو دوایە شاگردە زۆر چکۆلەکان پێکەوە بە دەنگی بەرز دەستیان کرد بە وتنەوەی دەنگی پیتەکان: ئەلف ئەلف ئا، بێ ئەلف با... باوە هوسێریش کە لە گۆشەی ژوورەکەدا چاویلکەکەی لەپشت گوێی توند کردبوو و سەری خستبووە سەر کتێبە ئەلف وبێکەی لەگەڵ شاگردەکان هاودەنگ ببوو و چون زۆر دەترسا هەڵەیەک بکا کە لە لای منداڵەکان شەرمەزار بێ، زۆر پەرۆش بوو و دەنگ لە گەرویدا دەلەرزی. ئەم حاڵەتەی ئەو لە لایەکەوە ئێمەی خستبووە پێکەنین و لە لایەکی دیکەشەوە گریانمان دەهات، خوا دەیزانێ تا ئاخری ژیانم ئەوڕۆژەو ئەو دوایین دەرسەم لە بیر ناچێتەوە.

لەم کاتەدا بوو کە دەنگی زەنگی کلیسە هات و ڕایگەیاند کە نیوەڕۆیە و زەنگەکانی کلیسە ئاوازێکی پیرۆزیان بە گوێی خەلک گەیاند. بەڵام هەر لەم ساتەدادەنگی تەپڵ و شەیپووری سەربازە ئاڵمانیەکانیش کە لە مەشقی نیزامی دەگەڕانەوە هاتە گوێ. میسیۆ هامیل ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو، هەستایە سەر پێ. لە هیچ کات دا قەدو باڵای مامۆستام ئەوەندە بەرز و ڕێکو پێک نەدیبوو... وتی:

هەواڵانی بەڕێز...! منداڵانی خۆشەویست...! هەواڵان... منداڵان! بەڵام چونکوو لە خەم و پەژارەدا گەرووی گیرا بوو دەنگی دەرنەدەهات. چووە نزیک تابلۆکەو گەچێکی بە دەستەوە گرت و بە دەسێکی بە هێز و تواناوە ئەم ڕستەی بە خەتێکی جوان و گەورە لەسەر تابلۆکە نووسی:

«بژی فەرانسە»

دوایە سەری نا بە دیوارەکەوەو بە دەست ئاماژەی کرد کە دەرسەکەمان تەواو بوو، خواتان لەگەڵ.

# ڕازی هاوبەش



وەرگێڕانی بۆ کوردی: عەلی کاردۆست

«مۆنترئاڵ» شارێکی یەکجار گەورەیەو وەکو هەموو شارە گەورەکان شەقامی باریکیشی هەیە، بۆ وێنە شەقامی «پرێنس ئەدوارد» کە درێژاییەکەی تەنیا چوار بلوکەو بە خاڵێکی بەستراو کۆتایی دێت. کەس شەقامی «پرێنس ئەدوارد»ی بە باشی «پییەردۆبێن» نەدەناسی، لەبەر ئەوەی «پییەردۆبێن» لە سی ساڵ لەمەو بەرەوە بۆ ئەو خێزانانەی کە لەم شەقامەدا دەژیان، شیری دەبرد. «پییەردۆبێن» لە پانزدە ساڵ لەمەو بەرەوە بۆ گەیاندنی واگۆنی شیر لە ئەسپێکی گەورەی سپی کە ناوی «جۆزێف» بوو کەڵکی وەردەگرت. لە مۆنترئاڵ، بە تایبەت لەو بەشەی کە فەرانسەییەکی زۆر دەژیان، ئەسپەکانیان وەک منداڵان بەناوە پیرۆزەکانەوە بانگ دەکرد. یەکەم جار کە ئەسپە ئێستایش دەستی پێوە نەداوە. کاتژمێر پێنجی هەموو بەیانییەک «پییەر» دەڕۆیشتە تەوێڵەی کۆمپانیاکەی «پرۆنیکل» و واگۆنەکەی بۆ گوێزانەوەی شیر بە «جۆزێف»ەوە دەبەست. «پییەر» لە کاتێکدا لە جێی خۆی دادەنیشت دەیوت: «بەیانیت باش دۆستی دێرینم». جۆزێفیش سەرێکی بەرەو ئەو دەلەقاند. لێخوڕەکانی تر پێدەکەنین و دەیانوت ئەسپەکە بۆ «پییەر» بزە دەکات. «جاکووس» بەرپرسی تەوێڵە دەیوت: «باشە پییەر، وەڕێ کەوە!» پییەریش بە دەنگێکی نەوی بە جۆزێفی دەوت: «بۆ پێشەوە ئەوینی من!» بەم شێوەیە «جۆزێف»و «پییەر» بە تێهەڵکێشێکی جوانی بێ وێنەوە بەرەو کەرتی خواروی شەقامەکە بەڕێدەکەوتن. واگۆنەکە بە بێ

گەورە سپیەکە هاتە کۆمپانیای بەرهەم هێنانی شیرو شت و مەکی تر «پرۆنیکل»، ئەسپەکە ناوێکی تایبەتی نەبوو. پاشان هێشتیان «پییەر» لە ئەسپەکە کەڵک وەرگرێت.

«پییەر» دەستێکی بەسەر و مل و زکی جوانی ئەسپەکە داهێنا. سەیرێکی چاوانی کردو وتی: «ئەسپێکی مێهرەبان، نەجیب و شایانی باوەڕە. دەبینم لە چاوانی تیشکی دەبریسکێتەوە. لەمە بە دوا بەناوی «جۆزێف»ەوە بانگی دەکەین، چونکە جۆزێفی پیرۆزیش هەروەها مێهرەبان، نەجیب و شایانی باوەڕ بوو و خاوەنی ڕۆحێکی بەرز. «جۆزێف» لە ماوەی یەکساڵدا ڕێگەی گوێزانەوەی شیرەکە بە باشی «پییەر» فێر بوو، «پییەر» بە شانازییەوە دەیوت: پێویستی بە گرتنی هەوسارو ڕەشوەی ئەسپەکە نیەو تا کۆنترۆڵی «پییەر» سێ بلوکی شەقامی«کاترینی پیرۆز»ی دەبڕی و پاشان بەلای ڕاستدا دەچەرخاو پاش پێوانی دوو بلوک لە شەقامی «ڕۆژلین»، بەلای چەپدا کە نێوی شەقامی «ئەدواردی پیرۆز» بوو، دەچەرخا. ئەسپەکە لە پێش دەرگەی یەکەم خانوو ڕادەوەستاو سی چرکە چاوەڕوان دەبوو تا «پییەر» بێتە خوارێ و شووشەی شیرەکە لە پێش دەرگەکە دانێت. پاشان دەکەوتە ڕێ. دوو خانووی دەبواردو لە پێش دەرگەی خانوی سێیەم ڕادەوەستاو بە پێیە تا دوا ڕادەی شەقامەکە ئەم کارە درێژەی بوو. «جۆزێف» بە بێ کۆنترۆڵی «پییەر» وەردەچەرخاو لە لای دیکەی شەقامەکەوە دەگەڕایەوە. بەڵێ «جۆزێف» ئەسپێکی زیرەک و هۆشیار بوو. «پییەر» بەم هونەرەی «جۆزێف» شانازی دەکردو دەیوت: «من هیچ کاتێ هەوسارم بە دەست نەگرتووە. جۆزێف بۆ خۆی دەزانێ لە کوێ ڕادەوەستێ. مرۆڤێکی کوێریش دەتوانێ لەگەڵ جۆزێف کە واگۆنەکە ڕادەکێشێ، ڕێگە ببڕێ». کات بەم شێوەیە تێدەپەڕی. «پییەر»و «جۆزێف» هەردوو پێکەوە نەک بە جارێ، بەڵکو هێدی هێدی پیر دەبوون. سمێڵەکانی «پییەر» کە چەشنی سمێڵی شێرماسی بوون. ئێستا بە یەکجاری ڕەنگیان پەڕی بوو، «جۆزێف»یش ئەدی توانای ئەوەی لێبڕا بوو وەکوو جاری جاران لە هاتو چۆ دابێ. «جاکووس» بەرپرسی تەوێڵە، نەیدەزانی ئەوان پێکەوە پیر دەبن تا بەیانی یەک «پییەر»ی بینی گۆچانێکی بە دەستەوەیەو بە پێکەنینەوە وتی: «هۆ پییەر خۆ ناشێ نەهات رووی تێکرد بی؟!»، «پییەر» بە کزی وەڵامی دایەوە: «هەڵبەت وایە جاکووس، مرۆڤ کە پیر دەبێ ئەدی لە پێ دەکەوێ» جاکووس وتی: «ئەبێ بەو ئەسپە فێرکەیت چۆن شیرت تا بەر دەرگە بۆ بێنێت. خۆ ئەو هەموو کاری دەزانی». «پییەر» هەر چل خێزانە دانیشووەکەی شەقامی «پرێنس ئەدوارد» کە شیری بۆ دەبردن، دەناسی. چێشکەرەکان دەیانزانی کە «پییەر» خوێندەواری نیە. ئەوان لە باتی ئەوەی کە باوە یادداشتێک لە نێو شووشە خاڵیەکان دابنێن و داوای شیری زیاتر بکەن، کاتێ دەنگی چەرخەکانی واگۆنی «پییەر»یان دەبیست کە لەسەر تەختی شەقامەکە دەڕۆیشت بانگیان دەکرد: «پییەر! ئەمڕۆ لیترێک شیری زیاترمان بۆ بێنە!»

«پییەر» بە خۆشحاڵییەوە وەڵامی دەدایەوە: «وابزانم ئەمشەو چێشتەنگاو پێکەوەن!» مێشک و بیری «پییەر» هۆشیار بوو. کاتێ دەگەیشتەوە تەوێڵەکە، لە بیری نەدەچووەوە بە «جاکووس» بڵێ: «خێزانی پاکۆ ئێتر ئەمڕۆ لیترێک شیری زیاتریان وەرگرت و خێزانی لیمۆینزیش یەک گالون خامەیان کڕی» . «جاکووس» ئەمانەی لە دەفتەرێکی چکۆلە دا کە هەمیشە پێی بوو، دەنووسی. هەر کام لە شۆفیرەکان بە پێویستیان دەزانی پسووڵەیەکی حەوتوویی وەدەست خەن، پارەکان کۆ بکەنەوە، بەڵام لەبەر




ئەوەی «جاکووس»، «پییەر»ی خۆش دەویست، لەسەر ئەم کارە لێبوردبوو. کارێک کە «پییەر» دەبووایە ئەنجامی بدایە ئەمە بوو کە کاتژمێر پێنجی بەیانی لەسەر کارەکەی ئامادە بێت و بە شوێن واگۆنەکەیدا کە هەمیشە لە جێگەیەکی تایبەت لە لای جۆگەلەی لای شەقامەکە بوو، بڕوات و شیرەکە وەرگرێت. پاش دوو کاتژمێر «پییەر» دەبێ بگەڕێتەوە، لە جێگەکەی بە ئەستەم دەهاتە خوارێ، لە «جاکووس» ماڵئاوایی دەکرد و شەلە شەل بۆ کەرتی خوارووی شەقامەکە بەڕێ دەکەوت. بەیانی یەک بەڕێوەبەری گشتی کۆمپانیاکەی «پرۆنیکل» بۆ پشکنینی داواکاریەکانی سەر لە بەیانی هاتە نێو کۆمپانیاکە. «جاکووس»، «پییەر»ی بەو نیشان داو وتی: سەیری کە ئەو چۆن لەگەڵ ئەو ئەسپە دا دەئاخاوێ، چاوت لێیە کە چۆن ئەسپەکە گوێ لە قسەکانی «پییەر» ڕادەگرێ و ملی بۆ دەلەقێنێ! چاوت جوان لە نیگای چاوی ئەسپەکە بێت! لەو بڕوایە دام ئەم دووانە نهێنیەکی هاوبەشیان هەیە. من زۆر جار هەستم بەوە کردووە، لەوانەیە هەردووکیان زۆر جار لەبەر خۆیانەوە بە دەم ڕێوە، بە ئێمە پێ بکەنن».



«جاکووس» به پەژارەوە وتی: ئاغای بەڕێوەبەر! «پییەر» پیاوێکی باشە، بەلاّم تەواو بە سالاّ چووە. هەر بۆیە پێشنیارێکم هەیە، داوا دەکەم «پییەر» خانەنشین بکرێ‌و مووچەی خانەنشینی پێ بدرێت، بەڕێوەبەری کۆمپانیاکە بە پێکەنینەوە وتی: «بەڵێ هەڵبەتە لە پێشینەی ئەو ئاگاداریم هەیە. سی ساڵی رەبەقە لەم رێگەیە دا بەردەوام کار دەکات بێ ئەوەی نیمچە نارەزایەتی‌یەکی دەربڕیبێ. پێی بڵێ ئێستا ئیتر کاتی پشووی هاتووە. مووچەی خانەنشینی‌یەکەی بە قەدەر مووچەی ئێستای دەبێت». بەلاّم «پییەر» پێی خۆش نەبوو خانەنشین بێت. لە بیری ئەوەی ئیتر «جۆزێف» نەبینێ مێشکی دەتەقی. بە جاکووسی وت: «من‌و جوزێف هەردووکمان پیرین. با جارێ پێکەوە کاربکەین. هەر کات جۆزێف ئامادەی دانیشتن بوو، منیش ئیتر کار ناکەم». «جاکووس» کە پیاوێکی میهرەبان بوو یەکسەر تێگەیشت. نهێنی‌یەک لە نێوان «پییەر» و «جۆزێف» دا بوو کە هەستی هەر کەسێکی دەبزواند. وەک بڵێی هەر کام لەوان، بەشێک لە توانای شاردراوەی یەکتریان بە شانەوە بوو. کاتێ «پییەر» لەسەر جێگەکەی دادەنیشت و کاتێ واگۆنەکەیان بە «جۆزێف»ەوە دەبەست، هیچ کامیان پیریان نیشان نەئەدا. بەلاّم کاتێ کار تەواو دەبوو «پییەر» شەلە شەل لەسەر و خوارەکەی شەقامەکە بەڕێ دەکەوت و هەروەها ئەسپەکە، کاتێ ملی شۆڕ دەکردەوەو بە هیلاکی بەرەو تەوێڵە دەگەڕایەوە، هەردوو رەنگی پیریان لێ دەنیشت، سەر لە بەیانی رۆژێک کاتێ «پییەر» هاتە نێو کۆمپانیاکە، «جاکووس» هەواڵێکی دڵتەزێنی پێدا. سەر لە بەیانییەکی سارد. هەوا یەکسەر تاریک بوو. ئەو بەیانی‌یە، زۆر سارد بوو، کلو بەفرەکان کە شەو تا بەیانی باری بوون، وەک میلیۆنان ئەلماس لە لای یەکدا ئەدرەوشانەوە. «جاکووس» وتی: «پییەر» ئەسپەکەت «جۆزێف» ئەم بەیانی‌یە لە خەو هەڵنەسا، خۆ دەزانی ئەو زۆر پیر بوو و تەمەنی بیست و پێنج ساڵە «پییەر»، ئەسپی بیست و پێنج ساڵە وەک مرۆڤی حەفتاو پێنج ساڵەیە. «پییەر» لەسەر خۆ وتی: «بەڵێ، من تەمەنم حەفتاو پێنج ساڵە و ئەدی ناتوانم جۆزێف ببینم»، جاکووس وتی: «هەڵبەتە ئەتوانی بیبینی، کەلاکەکەی لەوێ کەوتووە، برۆ بیبینە». «پییەر» هەنگاوێکی بەرەو پێش هەڵگرت، پاشان پاشگەز بۆوە: «نە... نە... تۆ تێ‌ناگەی جاکووس...» جاکووس دەستێکی نایە سەر شانی «پییەر» و وتی: «ئەسپێکی دی وەک جۆزێف پەیدا دەکەین، بە مانگێ رێگەکەی فێر دەکەی، هەروا کە جۆزێف دەیزانی، ئێمە...». نیگای «پییەر» ئاراستەی نێو چاوانی ئەو بوو. «پییەر» ساڵەهای ساڵ کلاوێکی گەورەی لەسەر دەنا کە لێوارەکانی پێش چاویان دەگرت و چاوەکانی لە بای تیژی بەیانیان دەپاراست. جاکووس سەیرێکی چاوەکانی «پییەر»ی کرد شتێکی وای تێدا بەدی کرد کە یەکسەر ورووژاندی. لەو چاوانەدا نیگایەکی وشک و مردووی بەدی کرد. چاوانی «پییەر» ژانی قوڵی دڵ و رۆحی ئەوی تێدا دەبینرا. وەک بڵێی دڵ و روحی مرد بێ. جاکووس وتی: «پییەر» ئەمرۆ کار مەکە، «پییەر» بە ئەستەم بەرەو خوارووی شەقامەکە بەڕێ کەوت. ئەگەر کەسێک نزیکی بووایە، دەیتوانی دەنگی هەناسەی نیوە خنکاوی ببیسێ‌و فرمێسک لە چاوانی ببینێ کە بەسەر گۆنایدا، دەتلایەوە. «پییەر» شۆستەکەی بڕی و رۆیشتە نێو شەقامەکەوە. لەناکاو دەنگی نەڕەی شۆفیری لۆرییەک کە بە توندی نزیک دەبۆوە لە ئاسمان خرۆشاو، پاشان دەنگی تورموزی لۆرییەکە هات، بەلاّم «پییەر» لەوانەیە نەیبیستبێ.

* * *

پاش پێنج دەقە لێخوڕی ئامبۆلانس وتی: «مردووە، یەکسەر لە جێدا تەواوی کردووە». جاکووس و گەلێک لە دابەشکەرانی شیر لەوێ بوون و جەستەی ئارامی ئەویان سەرنج ئەدا. شۆفیری لۆرییەکە بە نارەزاییەوە وتی: «هیچم پێ نەدەکرا. ئەو راستەوخۆ بەرەو رووم هات. لەو بڕوایە دام نەیبینی، بە چەشنێ بەرەو رووم هات وەک بڵێی کوێر بوو». دوکتورێ ئامبۆلانسەکە دانەوی و وتی: «کوێر؟! بەڵێ ئەم پیاوە کوێر بوو. ئەم پیاوە لە پێنج ساڵ لەمەو پێشەوە کوێرە». دوکتۆر بەرەو جاکووس وەرچەرخاو وتی: «وتت کە بۆ ئێوە کاری دەکرد؟ نەتاندەزانی کوێرە؟». جاکووس لەسەر خۆ وتی: «نە... نە... کەسمان نەیدەزانی. کەسێک دەیزانی و بەس. هاوڕێی دێرینی ئەو جۆزێف. ئەمە نهێنی‌یەک بوو لە نێوان ئەم دووانەدا...»



# دەربەندی سەوز

• گرانت ماتوسیان
• عەزیز مورادی

گرانت ماتوسیان لە ساڵی ١٩٣١ لە ئەرمەنستانا لە دایک بووەو نووسەرێکی ناودارە کە ساڵی ١٩٥٩ دەستی کردووە بە نووسین و تا ئێستا چەند پەرتوکی داوەتە دەر کە بە گورجی لە دڵی خوێنەراندا جێگەیان گرتووە. قارەمانی پەرتوکەکانی شوان و وەرزێرو ئاسن گەرەکیونشینەکانن.

تریشقه به دەنگێکەوە لە چیای دا، کەوتە قەراخێکەوەو ڕۆیشتە نێوە زەوییەوە. چیا ئەم چیا خۆلەمێشیە، قورس و لەسەر جێ بوو و تریشقە بە زۆر توانی تەنیا دوو تیکەی چکۆلانەی لێ جودا کاتەوە.

داوێنی کێوەکە بژوێن بوو و ئەو زەویە سەوز و لەبارە گۆڕستانی هەموو ئەو تریشقانە بوو کە لەوێنە دەبروسکانەوە. بەهارو هاوین هەموو تریشقەکان دەکەوتنە نێو گۆڕەوەو دار بەڕوی قەراخ چیاکە، ڕێز و سوپاسی خۆی دەردەبڕی بۆ چیاکە کە سینگی دەکردە قەڵخان و ئیزنی نەدەدا کە بێ‌سوتێنن و بیکەنە خۆلەمێش.

تریشقەکە ئامادە بوو کە خێرا لە نوێوە لەسەر دۆڵ و کۆگا بدرەوشێتەوە، بەڵام بە هیچ جۆرێک نەیدەتوانی خۆی بنوێنێ. ماینەکە بە هێمنی حیلاندی و کوڕگەکەی خۆی بانگ‌کرد، چونکوو دەیزانی ئێستا هەور، تریشقە دەداو لەوانەیە کوڕگەکە بترسێنێ. بەڵام کوڕگەکە وای دەزانی دایکی بانگی دەکا بۆ گوان مژین و شیرخواردن، گوێی تیت کردەوە تا بزانێ لە ناخیەوە شیری دەوێ یان نا، نا. زۆر حەزی لە شیر خواردن نەدەکرد، دەیویست گیاو گوڵ بۆ پێوەکات... هەور تریشقاندی، کوڕگەکە ترساو هەڵات، ئەوەندە ترسا بوو کە دایکی نەدی و بەرەو شوێنێکی تر ڕای‌کرد. دایکیشی بە شوێنیدا هەڵات، بەڵام ڕاوەستا، چونکوو گوریسێک کە سەرێکی بە درەختەوەو سەری تریشی بە ملی ئەوەوە بوو گەرووی گوشی. خێرا حیلاندی و کوڕگەکەی بەرەو لای خۆی بانگ‌کرد. کوڕگەکە گەڕایەوە، گوێی تیت کردەوە، گوێی لە ڕاکردنی باران بە سەر گەڵای بەڕوگرت، چاوی لە چیاو دلیق کرد، برژانگی دابە یەکاو خێرا ترسی لە بیر چۆوە. وای دەزانی بۆ لای دایکی چووە تەنیا بۆ شیرخواردن. ئەو گوڕکە، نومایەک بوو بەڵەک لەگەڵ خاڵی وردی سپی وەک وردە بەفر، دەتگوت تەواوی لەشی بە وردە بەفر پۆشراوە، پێی ڕاستی تاقیتی (ساق پێی) بە تەواوی وەک بەفر سپی بوو.

گاکێوی و ئاسکەکان، بزن و مێکان دەهاتنە سەرچاوەی ئەم دۆڵە بۆ ئاوخواردنەوە، ماینەکەش کە لە تەمەنی درێژی دا، کوڕگی زۆری پەروەردە کردبوو، دەهاتە ئەو دۆڵە. بەڵام ئەو کوڕگە لە هەموویان جوانتر بوو. کلکێکی درێژ و سەرێکی چکۆلەی بوو، خاڵێکی سپی وەک ئەستێرە جوانی دەدا بە تەوێڵی. یاڵ و کلکی ڕەش بوو.

چاوەکانیشی جوان بوو، هەموو ماینێک چاوی جوانەکە زەوی و ئاسمانی تێدا بەدی دەکرێ. ئێستا لە چاوەکانی کوڕگەکەش دار بەڕو و گوڵی دلیق و دایکی ئاڵ ڕەنگی و تەواوی دەربەندە سەوزەکە دەبینرێ. دڵۆپە بارانێ دای لەسەر پشتی و ترساندی. کوڕگەکە هەڵات‌و دایکی بەجێ هێشت. دایکەکە ئیتر بانگی نەکرد. باران خۆشی کردبوو و هەتاو ئەدرەوشایەوە. دەشتە سەوزەلانەکە لە ژێر تیشکی هەتاودا ئەدرەوشایەوە. تەنیا دار بەڕووی ئەو دەربەندە، بنجە دلیق، پشتی تەڕبووی ماین و کوڕگەکەو ڕووبارێ کە لە چیا خۆلەمێشیە سەرچاوەی دەگرت و لە دەشتی سەوزەلان دا ڕەوان بوو - هەموویان پاش باران هاتن لە ڕووناکی هەتاودا ئەدرەوشانەوە، لە ڕووبارەکە بۆی تریشقە دەهات و کوڕگەکە کەمێ ترسا. لە بنجکە دلیقەکەیش بۆی تریشقە دەهات، کوڕگەکە بە ترسێکەوە لە بنجکە دلیقەکە سڵی کردو دوای کەمێ هەڵپەڕو داپەڕ، سەری هەڵگەڕاندە دواوەو چاوێکی لەدلیقەکە کرد. دوایی لەسەر خۆ وەڕێ‌کەوت و لە نوێوە هەموو شتی دەوروبەری بۆن دەکرد.

ماینەکەیان لە وێنە دەبەستەوە تا بلەوەڕێ و تەواوی بۆ خۆش و ناخۆشەکانی ئەو دەربەندە بۆی ئاشنا بوو. گیای دەخواردو هەستی دەکرد کە چۆن لە گیاکان بۆی تووکی تەڕی مەڕەکان دەگاتە لوتی. ئەمە دەگەیەنێ کە لەو بەر ملەوە مەڕەکان دەلەوەڕێن و سەگی گەورە پارێزگاریان لێ دەکەن.

ماینەکە سەری شۆڕکردەوەو یەک‌و دوو جار گیای بردە دەمەوەو خواروی، بەڵام لە ناکا هەستی کرد مەترسیەک دەربەندەکەی داگیرکردووە. لوتی قنج کردەوە تا بۆ نامۆکان باشتر بگاتە لوتی. پەپولەکان دەفڕین، مێش هەنگەکان گۆرانیان دەخوێندەوەو ڕووبار خورەی دەهات. کوڕگەکە ملی تیت کردبووەوەو لە دەور دلیقەکە خڕی دەخوارد، بەڵام ماینەکە نەی‌دەویست، تەنیا ئەم دەنگانە ببیستێ، نەی‌دەویست تەنیا ئەم شتانە ببینێ. بەم حاڵە لە دەربەندەکە مەترسیەک بوو. دەنگی ئەو مەترسیە نەدەگەیشتە گوێ، مەترسیکە نەدەبینرا، بۆی مەترسیکە لە هەوادا بە لووت نەدەهات، بەڵام ماینەکە نەی‌دەتوانی بە دڵنیاییەوە بلەوەڕێ. قەڵس و وەڕزی ماینەکەی داگرت، چونکو دوژمن لە دەربەندەکە بوو، بەڵام دەنگی نەدەهاتە گوێ و نەدەبینرا. لەناکاو کوڕگەکە چاوی لە شتێک کردو دوایی سەیری دایکی کرد. ماینەکە هێشتا ئەو «شتە»ی نەدەدی. ڕاوەستا بوو، ملی بەرز و گوێی قوت کردبووەوەو چاوەکانی ئەدرەوشانەوە. کوڕگەکە پۆزە چکۆلانەکەی بەرەو ئەو «شتە» درێژ کردەوەو بەرەو لای ڕۆیشت. لەو کاتەدا بۆی ناحەزی گورگ گەیشە لوتی دایک. کە دایکەکە دیتی گورگ بە باز لە زەوی بەرز بۆوە، حیلاندی و بەرەو کوڕگەکە چوو.

ماینەکە بەرەو کوڕگەکەو گورگەکە هەڵات، بەڵام کەوتە زەوی. بازەتوندەکەو گوریسەکەی ملی خستیە زەوی. کوڕگەکە لە قەراخ دلیقەکەوە بازی بردە قەراخێکەوەو لە کاتێکدا خڕی دەخوارد، بەرەو دایکی ڕای کرد، بەڵام گورگەکە ڕێی لێ دەگرت. لەم کاتەدا گوریسەکە ملی دایکی گوشی. کوڕگەکە لەسەر گورگەکەوە بەرەو لای دایکی بازی برد، بەڵام گورگەکە لاقی گرت. کوڕگەکە حیلاندی و کەوتە زەوی، بەڵام خێرا هەستایە سەر پێ. حیلەی کوڕگەکە گەیشتە ئەو دیو ملەکانەوە کە مەڕەکان دەلەوەڕیان و سەگەکانی نێو ڕان، بەتایبەت سەگێکی پۆزەڕەش بەناوی «توپوش» ملی بەرز و گوێی تیت کردەوە. کاتێ کوڕگەکە حیلاندی دایکی لەسەر لاقی ڕاست بۆوەو بە تووڕەیەکەوە بەرەو کوڕگەکە بازی برد، گوریسەکە پروکیا و وەک قەمچی لە لاقی پێچیا. گورگەکە دەست‌بەرداری کوڕگەکە بوو. ماینەکە هێرشی دەکردو گورگەکە دەچوە دواوە. ماینەکە سەری شۆر کردبووەو ئارام و بە دڵەڕاوکێوە دەڕۆیشتە پێشەوە، گورگەکە خۆی لکاند بە زەوییەوەو ئامادەی باز بردن بوو کە گەرووی ئەسپەکە بگرێت و بە ملیدا شۆڕ بێتەوە... بەڵام لەو کاتە دا ماینەکە دەستی کرد بە خڕخواردن. گورگەکە بازی نەبرد، بەڵکو خڕی خواردو دروست لەبەر پۆزەی ماینەکە ڕاوەسا. کوڕگەکە خۆی بە سینگی دایکیەوە نوساندبوو. ماینەکە بە هەموو هێزیوە لە بێچووەکەی پارێزگاری دەکردو لەگەڵیدا خڕی دەخوارد. گورگەکەیش لە دەوری ماینەکە خڕی دەخواردو لەناکا بە دوو کورتەباز خۆی خستە بەرپۆزەی ماینەکە، بەڵام ماینەکە خێرا خڕی خوارد و لەقەیەکی وەشاند. گورگەکە لە هەڵێکی ڕەخساو هێرشی کردە سەر ماینەکە، بەڵام نەیتوانی گەرووی بگرێ، گورگەکە بازی بردە سەر سینگی ماینەکە، ماینەکە خڕی



دەخواردو لە کوڕگەکەی پارێزگاری دەکرد.

بەرێوار هات، گورگەکە بە زۆر خڕی دەخواردو خۆی لەسەر زەوی دەکێشا، ئەسپەکەش دەکەوتە زەوی و راست دەبۆوە، بە زۆر خڕی دەخوارد. چاوی هەردووکیان رەش دەینواندو بە زۆر یەکتریان دەدی.

لەم کاتەدا کوڕە شوانە رۆیشتە سەر ملەکەوە، ئەو شتەی کوڕە شوانە دەی دی ئەوەندە سەر سوڕهێنەر بوو کە لەسەر زاری کوڕە شوانە وشەیەکیش نەهاتە دەرەوە: گورگ بە ملی ماییەنەکەیا خۆی هەڵواسی بوو و ماییەنەکە ئیتر نەیدەتوانی بە لەقە گورگەکە لە خۆی دوورکاتەوەو لەوە دەچوو خێرا بکەوێتە زەوی یەوە.

لە ملەکانی ئەوبەرەوە هەرا هەڵسا:

کوڕە لاوە، های! ... گورگ خەریکی کوشتنی ئەسپەکەیە!... سەگەکان لە کوێن؟!

کوڕەشوانە لە ترسا تەنانەت نەی دەوێرا هاواریش بکا. سەگەکانی رانەکە - توپوش، بوب، سوا، بوگار، چالاک و شامبر - لە جێگەکەیان بازیان بردو کەوتنە خۆ، سەریان قوت کردەوە. دەستیان کرد بە راکردن. توپوشی پۆز رەش، گورگ گرێکی لێهاتو، بێ حەپین نزیکی گوڕگ دەبۆوەو دەی گرت، ئێستاش لەبەر هەموویانەوە رای دەکرد. کاتێ ماییەنەکە دەکەوتە زەوی، دەڵە گورگەکە وەک بڵێی لە خەو دەنگی حەپینی سەگەکانی هاتە گوێ، بەڵام نەیدەتوانی باوەڕ بکا سەگەکان هێرشیان بۆ هاوردووە، چارەنووس نەدەبووایە ئەوەندە بێ رەحمانە هەڵسوڕایەو ئەرک و مەینەتی یەک رۆژەی بە با بدا و ئەو وا لێ بکا کە بە زگی برسی و دەستی خاڵیوە بگەڕێتەوە بۆ لای بێچوەکانی. کاتێ ماییەنەکە دوایین کاتەکانی ژینی دەبردە سەرو چاوەکانی رەش دەیانواندو لە ئێش و ئازار، گێج و کەڕ ببوو، دەنگی گەفینی سەگەکانی هاتە گوێ و باوەڕی کرد کە لە بەر کوڕگەکەی ئەو دەگەفن. چارەنووس نەدەبوایە ئەوەندە بێ رەحم بێ کە کوڕگەکە تەنیا مانگێک بژی. دەنگی سەگەکان دەهاتە گوێ، بەڵام دەڵە گورگەکە دیسان باوەڕی نەدەکرد کە دوای ئەم سەرکەوتنە پڕ ئێش و ئازاراوی یە نەگاتە ئامانج. بێچوەکانی لە دەم کونەکەی بەزگی برسیوە چاوەڕێن و گوانەکانی خاڵی و بێ شیر...

سەگەکان سواری سەرو ملی دەڵە گورگەکە بوون و دەست وپێیان قەپ لێگرت. بۆ دەڵە گورگەکە هێزێک نەمابوو کە خۆی لە دەستیان رزگار کات. خۆی بە زەوی دا نوساند تا

سەگەکان نەتوانن قەپ لە گەرووی بگرن. دەڵەگورگەکە قەپی لە لاقی یەکێ لە سەگەکان گرت، سەگەکە لوراندی و خۆی خستە قەراخێکەوە، دەڵە گورگەکە راست بۆوە، سەگەکان لە دەوری کۆبوونەوە کە چاوەڕێ وەستان. سەگەکان زۆر بوون وبۆ دەڵەگورگەکە ئەستەم بوو کە خۆی لە دەست سەگەکان رزگار کات و بگەڕێتەوە کونەکەی کە بێچوەکانی لەوێدا چاوەڕێ بوون. گورگەکە چاوی لە سەگەکان دەکرد و ددانی چیڕ دەکردەوە. سەگەکانیش چاویان لە دەڵەگورگەکە کرد بوو، لە ناکا یەکێ لە سەگەکان توکی راست کردەوەو بازی بردە سەر دەڵە گورگەکە و بە سینگ لە گورگەکەی داو خستیە قەراخێکەوە. دەڵەگورگەکە بە زۆر لەسەر پێی راوەساو زانی کە ترسناکترین سەگ، ئەو سەگە پۆزە رەشەیە. لە ملەی ئەولاترەوە هاواریان کرد: کوڕە لاوە، های!... یارمەتی سەگەکان بدە تا گورگەکە بخنکێنن! ... های. ماینەکە کەوتە زەوی. کوڕگەکە لە پاڵ دایکیدا راوەستا بوو، چاوەڕێ بوو تا دایکی هەستێتە سەر پێ، بەڵام دایکی راست نەبۆوە. کوڕگە شیرخۆرەکە پۆزەی بە زگی دایکیدا کێشا، بەڵام دایکی راست نەبۆوە ... سەگە پۆزە رەشە کە ئاخریش نەی توانی گەرووی دەڵەگورگەکە بگرێ. دەڵەگورگەکە قەپی لێ نەگرت و ئەو لە گورگەکە نەدەترسا، بەڵام ئیتر بە شوێنی گورگەکەوە نەبوو، چونکو تۆپێک توکی ملی دەڵە گورگەکە لە دەمید، مابۆوەو لە گەروویدا گیری کردبوو. سەگی پۆزە رەش لە سەگەکانی تر کەوتبووە دواوەو بە توورەییەکەوە دەپژمی. دەڵەگورگەکە توانی خۆی رزگار کات.

کاتی خۆراوا کە هەتاو دەنیشت تەواوی دەربەندە سەوزەکە لە ژێر تیشکی هەتاو دا ئەدرەوشایەوە تەنیا دەوری ماینەکە، وەک خەڵووزرەش بوو و لاشەی ئاڵ رەنگی ئەسپەکە لە نێو ئەو قاپە رەشە ئارامی گرت بوو. ئەو قاپەرەشە، ئەو زەوییە رەشەکە نە ژێر سمی ماینەکە رووت بوو، گۆڕەپانی شەڕی دوو لایەنەی ماین و دەڵەگورگ بوو. کاتێ چاوت لەو زەوییە لەقە لێدراو و ژێر و ژوور بووە دەکرد، دەتزانی کە ماینە پیرەکە چەندە لەگەڵ دەڵەگورگەکەدا خڕی خواردووە. ئەو قاپە رەشە سێ ساڵی تەواو رەش ماوە، سێ ساڵی تەواو لەوێنەدا گیاو گوڵ سەوز نەبوو و ئێسقانی سپی لەشی ماینە پیرە دڵۆڤانەکە لەو قاپە رەشە کەوت بوو.

پاشان گیاو گوڵ سەوز بوو و دەربەندە سەوزەکە لە نوێوە بە تەواوی سەوز و شین بوو. کاتێ لەسەر ملەوەچاو لە دەربەندەکەدەکەی، دەربەندەکە بە تەواوی سەوزە. دار بەڕوی گەورە راست وەستاوە، چیا ئارام و بێ دەنگ لە جێی خۆیەتی و گوێ لە جوڵەی هەورەکان دەگرێ. گوڵە پێنج پەلەکانی دلیق لە ژێر تیشکی هەتاودا باز بۆوەو ئەسپی ئەستێرە تویڵ لە دەربەندە سەوزەکەدا دەلەوەڕێ.

ئەسپی ئەستێرە تویڵ سەرە جوانەکەی راست دەکاتەوەو چیاو دار بەڕوو و دلیقی پڕ گوڵو دەربەندی سەوزو شین و گەواڵە سپییەکانی ئاسمان لە چاوانیدا خۆیان دەنوێنن.

- تەواو بوو.
- تەواو بوو.
- نا
- بۆچی «نا»؟
- با ماینەکە نەمرێ
- من ناتوانم بڵێم کە ماینەکە نەمرد، چونکوو بەڕاستی ماینەکە مرد، کاتێ کوڕە شوانەکە لە ملە هاتە خوارەوە، ماینەکە مردبوو و کوڕگەکەی بە خەم و پەژارەوە لە سەر سەریدا راوەستا بوو. کاتێ شوانە هاواری کرد: «کوڕە لاوە، های!» لە ملەی ئەولاترەوە هاتە خوار، لەشی ماینەکە سارد و سڕکەوت بوو. شوانەکەو کوڕەشوانەکە لە قەراخ ماینە پیرەکە دانیشت بوون و بیریان دەکردەوەو چۆن شیر بە کوڕگەکە بدەن تا گەورە بێ.
- چۆن شیریان دا بە کوڕگەکە؟
- لە شیری ماینێکی تر.
- نا، با ماینەکە نەمرێ.
- من ناتوانم بڵێم نەمرد، چونکوو تەواوی هاوینی ئەو ساڵ من لە شیری ماینێکی تر شیرم بە کوڕگە هەتیوەکە دەدا.
- بۆچی ماینەکە مرد؟
- کاتێ من لە قەراخ ماینە پیرەکە بووم، شوانەکە وتی ماینەکە لە ترسی لە نێوچوونی کوڕگەکەی و توڕەییو قەڵسی دیقی کردووە.
- ئەو کوڕە شوانە تۆبووی؟
- بەڵێ من بووم، ماینەکەش هی ئێمە بوو، کوڕگەکەش، کوڕگی ماینەکەی ئێمە بوو.
- ئێستا کوڕگەکە گەورە بوو و بە لەقاو لە دەربەندە سەوزەکە دەلەوەڕێ؟
- بەڵێ ئێستا گەورە بووە و بەلەقاو لە دەربەندە سەوزەکەدەلەوڕێ.
- باشە لە نوێوە بلێ.
- ترێشقە بە دەنگێکی وشکەوە لە چیای داو کەوتە قەراخێکەوەو رۆیشتە نێو زەوییەوە. کێوە خۆڵەمێشیەکە قورس لە شوێن خوێدا بوو و ترێشقە بە زۆر توانی دوو تیکەی چکۆلانەی لێ جودا کاتەوە، دار بەڕو کەمێ ترسا، چونکوو ترێشقە، دار بەڕوەکانی دەسوتان و دەیکردن بە خۆڵەمێش، کوڕگە چکۆڵە ئەستێرە تەوێڵە لاق درێژەکەیش زۆر ترسا...

ئەوەندە ترسا کە وای دەزانی بۆ لای دایکی دەچێ، بەڵام لە راستیدا ئەوەندە ترسا بوو کە دایکی نەدەبیناو رای دەکرد. ماینە پیرەکە حیلەیەکی لە رووی دڵۆڤانیەوە کێشاو گوڕگەکەی بۆ لای خۆی بانگکرد...



# کتێب و بڵاوکراوەکان

بۆ دەست خۆشانەو ماندونەبوونی ئەو خۆشەویستانەی کە دڵسۆزی فەرهەنگن و لەو ڕێگایەدا تێدەکۆشن، ئەو جارەش بۆ ئاگاداری خوێنەران بەم چەن کتێب و بڵاوکراوانەی کە گەیشتۆتە کتێبخانەی ئاوێنە ئاماژە دەکرێ:



**دیوانی بێسارانی**
لێکۆڵینەوەو لێکدانەوەی
حەکیم مەلا سالح
ویراستار: حسین سبحانی



**قیام و نهضت علویان زاگرس**
ویراستەو ترجمەو تصحیح
محمد علی سلطانی



**چارەرەشی وەرزێر**
نووسراوی ئەحمەد خودادادە
عەبدوڵڵا مەردۆخ کردوویە
بە کوردی و پێشەکی و پەراوێزی
بۆ نووسیوە
پاریس ۱۹۹۵



**حکایەتی شیرین و فەرهاد**
میرزا ئەڵماس خان کەنوولەیی
پێداچوونەوەو لێکدانەوەی
ئەمین گۆجەری (شاهۆ)



**راهنمای علمی تدریس مؤثر**
رسول کیانی دولت‌آبادی
عضو هیئت علمی دانشگاه
تهران ۱۳۷۶




**کۆواری زەند**
بڵاوکراوەی ئەنستیتۆی کوردی لە ئەستەموڵ
ژمارە ۳ - ساڵی دووەم



**کۆواری تبیان**
نشریە علمی - فرهنگی - اجتماعی
ژمارە ۲۵-۲۴
سنە - زستانی ۱۳۷۶




**چیمەن و چیا**
دیوانی شیعری سەیید عەبدولقادر سیادەت
فارسی - کوردی

# زانایان نامرن



خوالێخۆشبوو محەمەد قازی وەرگێڕی بەناوبانگ، لە دوا ڕۆژەکانی مانگی بەفرانبار لە تەمەنی ٨٤ ساڵی دا چاوی لەسەر ئەم جیهانە بەست.

ناوبراو لە لاویەتی یەوە هاتۆتە تاران و تا دوایین تەمەنی هەر لەوێ ژیاوە، بە گوێرەی وەسیەتێک کە کردبووی لە تەنشتی (هێمن و هەژار)و ئەدیبانی تر لە شاری مهاباد بە خاک سپێردرا.

محەمەد قازی لە ساڵی ١٢٩٢ی هەتاوی لە شاری مهاباد هاتووەتە دنیا، باوکی میرزا عەبدولخالق قازی ئیمام جومعەی سەردەمی خۆی لە شاری مهاباد بووە.

قازی تا ساڵی ١٣٠٧ لە مهاباد خوێندنی سەرەتایی تەواو کردووە، لە ساڵی ١٣٠٨ دوای ئەوە کە باوکی لە دنیا دەرچوو، دێتە تاران‌و لە ژێر چاودێری مامی خوالێخۆش بوو دکتور جەوادی قازی ئەمێنێتەوە، لە ساڵی ١٣١٥ دیپلومی ئەدەبی و لە ساڵی ١٣١٨ لیسانسی حقوق لە ڕشتەی قەزایی بە دەستدێنێ.

محەمەدی قازی هەر لە قوناغی سەرەتایی خوێندن، هۆگری زمانی فەرانسە بوو، بەم بۆنەوە هەمیشە لەم زمانەدا لەناو قوتابیانی هاوڕیاری خۆی لە پێشەوە بوو. لە ساڵی ١٣١٧ کە هێشتا لە دانیشگا دەرسی ئەخوێند، دەستی دایە وەرگێڕانی دوو کتێبی (ساریوی دن کیشوت، نووسراوی سروانتس) و (کلود ولگرد، نووسراوی ویکتۆر هۆگۆ).

لەو بەرواره تا دوایین ڕۆژەکانی تەمەنی ئێستا کە نزیکەی نیو سەدەیە، دڵگەرم بووە لە وەرگێڕان، لەو ماوەیەدا دەیان کتێبی بە نرخ لە ئەدەبیاتی جیهانی بۆ پێشخستن و بەرزکردنەوەی فەرهەنگی ئێران پێشکەش کردووە.

وەرگێڕاوەکانی محەمەد قازی لە بڕگەکانی گرنگی مێژوو و فەرهەنگ و ئەدەبیاتی ئێران، خزمەتێکی گەورەو دەستهاتێکی مەزن بوو.

ژمارەی ئاسەوارو وەرگێڕاوەکانی محەمەد قازی لە ساڵانی تەمەنی زۆرترە، سەرەڕای ئەوە کە کاری وەرگێڕان بنچینەی کاری ئەو بووە، چالاکێکی زۆری هەبووە، وەکو هۆنینەوەی شیعرو چیرۆک‌و یادداشت نووسین.

هەندێ لە گرنگترین ئاسەوارو وەرگێڕاوەکانی محەمەد قازی بریتین لەمانەی خوارەوە:

### ١ـ وەرگێڕاوەکان:

- دن کیشوت - سروانتس
- جزیرەی پنگوئن‌ها - آناتول فرانس
- شازدە کوچولو - سنت‌اگزویری
- مادام بواری - گوستاوفلوبر
- زندگی من - چارلی چاپلین
- ژانی گەل - ئیبراهیم ئەحمەد (لە کوردی یەوە بۆ فارسی)

### ٢ـ چیرۆک:

- زارا (فارسی)

### ٣ـ یادداشتەکان:

- بەسەرهاتی وەرگێڕاوەکانی من

### ٤ـ چاوپێکەوتن:

محەمەدقازی کەسێ یە، چی‌کردووە (چاوپێکەوتنێکی بەرفراوان لەگەڵ شاعیری هاوچەرخ - سەیید عەلی سالحی)

### ٥ـ ژمارەیەکی زۆر لە نامەو دەستنووسەکان‌و یادداشتەکانی

لە کۆڕی پرسەو ماتەمی قازی، دەیان وتارو بابەت لە لایەنی زانایانی کوردو فارس خوێندراوەتەوە، هەروەها چەندین پارچە شیعر لە پرسەی ئەم خوا لێخۆش بووە پێشکەش کرا.

کۆواری ئاوێنە سەرەڕای یادکردنی ئەم پیاوەمەزنە لە خوای میری مەزن داوای لێخۆشبوونی بۆ ئەکات و سەرەخۆشی بە کۆمەڵگای فەرهەنگی ئەڵێت.

چەند ڕۆژێکە
کوڵی گریانێکی خەستم هەڵگرتووەو هیچ دڵۆپێک
چەند مانگێکە
گەروم پڕە لە ئاوازو هیچ بیسەرێک
چەن ساڵێکە
دیوانم پڕە لە شیعرو هیچ خوێنەرێک
نادۆزمەوە
کە فرمێسک و ئاوازو شیعرێکی لە لا
جێ بهێڵم

**بە داخ و کەسەرێکی زۆرەوە هەواڵی کۆچی ناوەختی دوو کەس لە بنەماڵەی سروەی خۆشەویستمان پێگەیشت، پەژارەو غەمێکی زۆر دایگرتین، کاکە مارف و کاک جەعفەر، دوو کەسایەتی فەرهەنگی لە تەمەنی لاوی‌دا کە هەر کامە هیوایەک بوون بۆ داهاتوی فەرهەنگی گەلەکەیان، بەم چەشنە جوانەمەرگ بوون. ئەم دوو خۆشەویستە هەرچەن ماوەیەکی کەم ژیان، بەڵام خزمەتیان بۆ هەمیشە لە یادو بیری هەر فەرهەنگ‌دۆستێک دا دەمێنێتەوە. لە خودای گەورە داوای ڕەحمەتی بێ‌برانەوەیان بۆ دەکەین و خۆمان لە تازیەی هاوکارانمان لە ناوەندی بڵاوکراوەی سەلاحەددین و گۆواری سروە هاوبەش دەزانین.**

«ئاوێنە»





**بەرپرس و کارگێرانی ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی**
**دەستەی نووسەرانی گۆواری سروە**
**وێڕای سڵاو و ڕێز**
**لە دەسدانی دوو شۆڕەسواری گۆڕەپانی فەرهەنگ‌و هونەر، برایان کاک مارف و کاک جەعفەر کە لە تافی لاویدا داسی مەرگ بێ‌بەزەییانە نەمامی ژیانیانی درەوکرد، خەم و کەسەرێک نیە کە بەم زوانە بڕەوێتەوەو لە یاد بچێ.**
**دەردو داخی کۆچی ناوەختی دوو لاو لە بەهاری تەمەن‌و لە دوا ڕۆژەکانی زستان‌دا دلی ئادەمیزاد وە ئێش دینی؛ جا ئەگەر ئەو دوو لاوە یەکێکیان مارف ئاغایی شاعیرو نووسەر و ئەوی تریشیان جەعفەری قازی نگارکێش و گرافیست بێ، کۆمەڵگای فەرهەنگی کوردەواری دەبێ چ تەوس و ئازارێکی وەدل کەوتبێ؟**
**داخ و هەزاران داخی گران لە دەست چەرخی بەدڕەفتار، چەند بێ‌بەزەییانە ئەو دوو گوڵەی باخی ئەدەب و هونەری هەڵوەراند.**
**نووسەران و هونەرمەندانی کورد لە تاران ئەم کۆستە گەورەیە بە کۆمەڵگای فەرهەنگی کورد لە سەرانسەری وڵاتدا سەرەخۆشی دەڵێن و هیوادارن لاوە دڵسۆزەکانی هۆگری فەرهەنگ و ئەدەب ڕێگا پیرۆزەکەی ئەو دوو کۆچکردووە ئازیزە درێژە پێ بدەن.**

# پیک بیستون

پیک بیستون، شماره ۳۶، سال ۱۳۷۶



## نوروز پیروز



# سرمقاله

دو بهار انقلاب اسلامی و بهار طبیعت از جمله مواهب بزرگ خداوند به جهان بشریت می‌باشند که سعادت معنوی و مادی انسانها را تضمین نموده‌و پیوسته آینده‌های درخشانتری را برای جوامع و ملل آزادیخواه‌و حق طلب دنیا رقم می‌زنند.

دههٔ فجر یادآور حماسه‌های تلخ‌و شیرین و وقوع حوادث مهم و حیاتبخش در بهمن‌ماه ۵۷ است که طی آن با ورود بنیانگذار نظام مقدس اسلامی حضرت امام خمینی (قدس سره الشریف)به‌ایران، تحولی اساسی در جهان اسلام به وجود آمدو حکومت شوم و سیاه پهلوی که مجری سیاستهای ظالمانه‌و دیکته شده استکبار جهانی خصوصاً آمریکای جنایتکار در ایران و منطقه خلیج فارس بود، سرنگون گردیدو جمهوری اسلامی در ایران شکل گرفت. در ۲۲ بهمن *خونهای دهها هزار شهید که سالهای متمادی در جریان مبارزات حق طلبانه سرزمین ایران را* گلگون کرده بود به ثمر نشست و غنچه‌های آزادی و استقلال شکفته شدو انقلاب اسلامی به پیروزی رسید.

اکنون که ۲۰ بهار از این حرکت توفنده و خروشان ملت مسلمان ایران می‌گذرد، همچنان شاهد بالندگی و رشد و توسعه انقلاب در اقصی نقاط جهان اسلام می‌باشیم. امیدواریم با حاکمیت روز افزون ارزشهای اسلامی و عملی شدن آرمانهای بلندو مقدس امام خمینی (ره)و شهیدان، جهان پر از عدل و داد گردد و زمینه تشکیل حکومت واحد اسلامی در دنیا فراهم آید.

سالگرد پیروزی انقلاب اسلامی را به تمامی انسانهای آزاده‌و حق طلب تبریک و تهنیت عرض نموده و برای روحهای به حق پیوسته در این راه علوّ مرتبه و روح و ریحان مسئلت می‌نمائیم.

در اسفند ۱۳۶۶ جهان شاهد وقوع حادثه‌ای تکان‌دهنده و ننگین در تاریخ بشری بود، فاجعهٔ بمباران شیمیایی شهر حلبچه عراق و کشتار وحشیانهٔ بیش از ۵۰۰۰ نفر از مردم بی‌دفاع و مظلوم کرد توسط هواپیماهای جنگی رژیم پلید عراق، داغی فراموش نشدنی و التیام نیافتنی بر پیکر بشریت نهاده شد. در این فاجعه سکوت مجامع بین‌المللی و مدعیان دروغین حقوق بشر مسئله‌ای دردناک و بغض‌آفرین است که آیندگان را به قضاوت و داوری دعوت می‌کند. فاجعه حلبچه لکهٔ سیاه و ننگینی بر دامان رژیم بعثی عراق و حامیان او برای همیشه تاریخ برجای گذاشت و این حقیقت را آشکار کرد که در واقع جهان به دو قطب پابرهنگان و

مستضعفان و قطب استکبارو طاغوت تقسیم شده است. و در این بین انقلاب اسلامی ایـران رهبری ستمدیدگان و مظلومان جهان را بر دوش می‌کشدو این امر وظیفه و مسئولیت همهٔ مسلمانان را اعم از کردو ترک و فارس و عرب سنگین‌تر می‌کند.

در اینجا ضمن تسلیت به تمامی بازماندگان بمباران شیمیایی حلبچه امیدواریم با وحدت جهان اسلام و برادری و همدلی همهٔ آزادگان جهان توطئه‌های دشمنان در نطفه خفه گردد و شاهد تکرار نظیر این جنایات در عالم نباشیم.

با فرارسیدن فصل بهار و آغاز سال نو و عید ملی و میهنی نوروز که موسم شکفتن طبیعت و سرسبزی و خرمی دشت و دمن است، دلهای هموطنان عزیزمان مملو از شـادی و طـراوت می‌گردد و یخهای کدورت و دو دلی آب می‌شود. در میان مردم کرد عید نـوروز از ارزش و قداستی ویژه برخوردار می‌باشد و با حلول سال نو شور و شعف در میان همگان حاکم می‌گردد و همانطور که طبیعت دگرگون می‌شود، دلها خانه‌تکانی شده و قلبها که به گفته امام صادق (ع) حرم الهی است از نامحرمان و شیاطین زدوده می‌شود.

در فرمایشات حضرت علی (ع) چنین آمده است که: «کُلُّ یَومٍ لا یُعْصَی اللّهُ فیه فَهُوَ عید». هر روزی که در آن معصیت و نافرمانی خداوند نشود آن روز عید است. این عید بزرگ را به تمامی هموطنان مسلمان تبریک عرض نموده و امیدواریم سـال نـو سـالی پـر از خـیرو بـرکت و مملوازپیروزی و سعادت و ایمان و معنویت برای جهانیان باشد.

